# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرەکی ئەنجومەنی کارگێری
وسەرنووسەر

مصلح جەلالی



لەم ژمارەیەدا



دەرگای روشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی
.مەیدانی خەلانی - بەغدا -
ت 8875795 (5) خەت

تکاوگلەیی: -
تکـایـە هەر نووسـەرێ خەتـەکـەی خۆش و شاش و جوان نەبێ، نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ.

بەرگی یەکەم: مندالانی کوردستان
بەرگی دووەم: گوندێ کۆرێ

ئابوونەی سالانە لەناو عیراقدا
7,000 دینار



# شۆرشی تموزو قادسیەی صدام

● فۆاد حسین ●

لەیــادی شۆرشــە مەزنـەکـەمیانـدا، شۆرشی 17 ـ 30ی گەلاوێــژ مۆمێکی تـر دادەگیـرسێنین و تەمـەن درێـژی بۆی دەخـوازین و پایـەبلندیو سەرکـەوتنی بەردەوام بۆ سەرکردە نەبەزەکەی، لەسەرووی هەموویانەوە قارەمانی گەل صدام حسین دەخوازین. . .

بێگــومـان لەو وەتـەی شۆرشـە پیـرۆزەکـەمـان هاتـۆتـە سەرحوکم، باری ژیانی عیراقیەکان نێکرا گۆراو ژیانێکی تری نویێ پر لەخۆشیو کامەرانییان بۆ رەخسێنرا. .

شۆرشی تەمممــوز بە نمــونـەیی دەژمێـردرێت نەك لە مێـژووی نیشتمـانـەکـەمـانـدا بەڵکـو لە مێژووی وولاتانی عەرەبیشدا، هەروەها وولاتانی جیهانی سێیەم گەلێ سوودو تەجرەبەیان لێ‌ی وەرگرتوون و باسی سەرکەوتنەکانمان دەکەن. .

بەتــایبــەتی بریــاری خۆمــاڵی کــردنی نەوت، کە بە جەنگێکی گەورە دەژمێردرێت لەگەڵ گەورەترین کومپانیای جیهــانیـدا بەجـەنگێکی ئابـوریی مەزن دەدرێتـە قەڵـەم، دوژمنــان گرەویـان لەسـەرکـردبـوو، گوایـە عیـراق توانـای سەرکـەوتنی نی‌یـە. . بەڵام گەلـە قارەمانەکەمان و بە هۆی پلانـی دروست و راست کە سەرکــردە بەوەفــاکــەی بۆی دانیــا. . سەرکــەوت. . دوای گەمــارۆدانێکی ئابــوریی

سەخت کە دوژمنانی وولاتەکەمان بەتایبەتی زایۆنیزمی دوژمن هاریکارییان لەگەڵ دەکرد. .

هەروەها چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بەوپەری ووردیو بە سەلیقەو ڕێگایەکی ئاشتیانە سەرکردەی پاڵەوان صدام حسین چارەسەری کردوو و کوردو عەرەب و گشت کەمایەتیەکان بوون بەیەك هێز بۆ بنیاتنانی عیراق و پاراستنی خاکی عیراق. .

ئێمە لەم نووسینەماندا کە یادی پیرۆزی شۆرشی 17 ـ 30ی تەممووز دەکەینەوە. . باسی دەسکەوت و بەخششەکانی شۆرشی لەو ماوە دوورودرێژەدا ناکەین چونکە گەلێکن و نایەنە ئەژماردن. . بەڵکو زیاتر نیشك دەخەینە سەر سەرکەوتنە نایابەکانمان لە ماوەی پێنج ساڵی جەنگە دا. . ئەوەی زانراوەو باو بووە وولات کە تووشی دوژمنێك دەبێت و ناچار لەگەڵیا دەجەنگێ، دەبێ ئەو جەنگە کاربکاتەسەر چالاکیو جوڵان و بنیاتنان و لایەنەکانی تری ژیان، ئەو چالاکیانە یان ڕادەوەستن یان کزولاواز دەبن. . . بەتایبەتی ئەگەر هات و ئەو جەنگە درێژەی کێشاو توندو تیژیو مەوداکەی فراوان و سەخت بێت. . .

بەلام هەرووەك دەزانین لە شەڕی قادسیەی دووەمدا ئەو جۆرە پێوان و لێکدانەوەو ئەژماردنە لاسایی و کۆنانە ئەنجامی پێچەوانەی گەیاند. . ئەمەشی لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەو دانانی پلانی ووردو چاك کە سەرکردەی قارەمانمان صدام حسین یەکەمین دەوری بینیوە، وە ئەو سیاسیو ڕۆژنامەنووسان و لێپرسراوانەی کە لە وولاتانی جیهانیدا لەم ماوەیەدا سەریانە لە عیراق داوە ئافەرینیان لەگەلی عیراق و سەرکردەکەی کردوون و ووتوویانە «عیراق بووەتە وەرشەیەکی ئیش کردنی گەورە شان بە شانی سەرکەوتنەکانی دەڕوات کە لە بەرەکانی جەنگدا سوپاکەی وەدیی دەهێنێت». . .

بەڵێ ئەمە ڕاستیەکی زاقەو هەرگیز نکوڵی لێ ناکرێت. . باری ئابووریو بەردەوام بوونی بنیاتنان هەرگیز لەگەڵ چەکدا کە بە شێوەیەکی ڕووبەڕووم موباشر بەکار دەهێنرێت جیاناکرێتەوە وە پەرەپێدان و گەشەکردنی ئابووری گرنگیەکەی بە گوێرەی گرنگیی چەك وایەو لە شەڕی ڕەوامان‌دا تاقی کرایەوە. . .

لەکاتی جەنگداو لە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیو لەکاتی دانانی بۆدجەی ساڵانەو پلانی پەنج



پارەیەی کە بۆ پرۆژە پیشەسازیو کشت وکاڵ و خزمەت گوازاریەکان تەرخان دەگریت هەرگیز لەوە کەمتر نەبووە کە پێش بەرپابوونی جەنگەکە تەرخان دەکرا . . ئەمەش بۆ ئەوەی ئابوریمان و شا دەمارەکانی بەردەوام لە پەرەپێدان و گەشەکردندا بن، کە لەڕاستیدا پشتیوانی‌ی جەنگەکە دەبێت . . ڕاستیەکانیش دەرکەوتن . . .

دیسان هەر لەم جەنگە ڕەوایەماندا دەوری سەرکردایەتی‌ی شۆرشی هەڤدەی تەممووزمان بۆ ئاشکراترو ڕوونتر بووەوە بەتایبەتی هەڤاڵ تێکۆشەر کاك صدام حسین ئەو دەورە نایاب و گرنگەی کە بووەتە هۆی وەدیهێنانی سەرکەوتنی بەردەوامان بەسەر دوژمنی داخ لەدڵدا . .

قارەمان صدام حسین یەکەمین دەورو نمونەی سەرکردە مێژووییەکان بینیوەو زیاتر لە گشت سەرکردایەتیەکی مێژووی عەرەبیدا . . بەڵکو لە جیهانی سێیەمدا . . بەتایبەتی لە بوارو مەیدانی جەنگداو شێوازی بەرێوەبردن و ئاراستەکردنی جەنگ و ئامادەبوونی شەخسی لە گشت شەڕو جەنگێکی گەورەو قورسداو پێشکەش کردنی ئامۆژگاریو بریاردانی کوت وپرو لەکات و زروفێکی زۆر ناسك و ووردو خێرادا . . سەرکردەی قارەمان صدام حسین بەڕوانین و تێبینیەکی زانستیانەو واقیعانەی سەرتاپایی چارەسەری چەمك و مەفهومی سەرکردایەتیو سەرکردەی چاك دەکرد کە لەگەڵێ بۆنەو موناسەبەتێکدا پەنجەی بۆ ڕاکێشاوەو دیاریان کردووە، بەتایبەتی لەو نامانەیەی کە بۆ دەزگا سوپاییەکان بەردەوام دەینێرێت . . ئەمانە گەورەترین هۆن بۆ سەرکەوتنی بەردەوامان بەسەر دوژمندا . . .

شۆرشی 17 ـ 30ی تەممووزی نەمر، هەر لە کاتی جەنگی قادسیەی دووەمدا لایەنەکانی کۆمەڵایەتی‌ی لە بیرنەچووە ئەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێت باری کۆمەڵایەتی‌ی عیراقیەکان پێش شۆرشی 17 ـ 30ی تەمووز، کە چەند ناخۆش و توشی چەورو ستەم ساخڵەتی بوو بوون . . عیراقیەکان تاڵیو نەخۆشیو برسێتیان چەشتووە ئەویش لەژێر سایەی هەندێ بەرێوەبەرانی کۆن پێش شۆرشە مەزنەکەمان . .

بەڵام شۆرشە پیرۆزەکەمان وە لەبەر ئەوەی مرۆڤ واتە عیراقیەکان هەم غایەت و هەم وەسیلەی شۆرشن و شۆرشی بۆ ئەوان بەرپاکراوە . . جا دەبێ ژیانیان بگۆردرێت و بە چەشنێکی کە بژین . . ژیانێکی پڕ لەکامەران و خۆشیو سەرفرازی . . لەڕاستیشدا ئەمانە هەموو هاتنەدی . .

ئەگەر شۆرشی 17 ـ 30ی تەمموز نەبوایە ئێستا لە عیراقدا عیراقیەکان لە بارێکی تردا دەژیان . .

عیراقیەکان سەربەخۆیی تەواویانەوەرگرت و وولاتێکی پێشکەوتووی بڵندو بەهێزیانە بۆ دروست کرا . .

عیراقیەکانیش هیچ درێخیکیان نەکردووە، چ لە کاری بنیاتنان و بەرهەم هێنانداو چ لە بەرەکانی جەنگدا لە هەردوو سەنگەردا سەرکەوتنی نایاب وەدی دەهێنن ئێستا خێزانێك نابینیت کورێکی یان دوو کوڕ ئەگەر زیاتر نەڵێین لە بەرەی جەنگدا نەبێت و لولەی تفەنگەکەی ئاراستەی سنگی دوژمن نەکردبێت . . .

واتە گشت عیراقیەکان بەشداری خۆیان لە جەنگدا نواندوون جا لەم یادە پیرۆزەدا کە یادی لەدایك بوونی شۆرشە مەزنەکەمانە شۆرشی 17 ـ 30ی گەلاوێژ . . پیرۆزبایی لە خۆمان و سەرکردەی قارەمان و سوپای پاڵەوانمان دەکەین . .

بەردەوام بێت کاروانی شۆرش . . کاروانی سەرکەوتن . . .



لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەیەك . . .

# دەربارەی جەنگی زەلکاوەی حوێزە

«شفیق محمود حسن»

لە ماوەی چەند مانگێکی پێشوودا ـ لە وولاتانی جیهاندا چەندەها کۆڕو کۆبوونەوە سازدرا دەربارەی باری پەرەسەندنی چەنگ لە نێوان عیراق و ئێرانداو چەندی دوورایتی مەترسی ئەو جەنگەو درێژەپێدانی لە لایەن رژێمی ئێرانەوە، .بەتایبەت پاش ئەو شکست هێنانە مەزنە کە بەسەر هێنەرەکانی ئێراندا هاتووە لەژێر لێدانی هێنرو زەبری سوپای چەکداری عیراقی لە ناوچەی زەلکاوەی حوێزەدا «هور الحویزە».

لەو کۆڕو کۆبوونەوانەدا ئەوەیان خستە پێش چاو کە توندو تیژترین جەنگێك بووە لە مێژووی هاوچەرخدا کە زیانێکی هەرە مەزن و گەورە لە قەوارەی سوپای رژێمێکدا بکەوێ کەرژێمی ئێرانە لەرووی سوپای‌ی‌و ستراتیژیەوە لە زەلکاوەی حوێزەدا «هور الحویزە» کە کوژراوی بەجیماو لەسەربازانی رژێمی هێرش هێنەر «رژێمی ئێران» گەیشتووەتە پتر لە «25» هەزار سەربازی کوژراوی لەجێماو لە سەرو بنی زەلکاوەدا، ئەمەو جگە لە تێك شکاندنی کەرەسەی جەنگی ئەو رژێمەکە مەبەستی یەکەوسەر خۆ گەیاندنی بووە بۆ داگیر کردنی ئەو ناوچەیەو لەئەنجامدا ببێتە رێخۆشگەرێ بۆ داگیر کردنی ناوچەی خواروی عیراق. .

بەلام. . سەربازانی هێزی چەکداری گەلی عیراق و سەرکردەی دلێرمان هەڤال صدام حسین لە دووهەم قادسیەیاندا ئامانجە پووچەڵەکانی ئەو رژێمە تاوانبارەی هەڵوەشاند کە بووە هۆی تێکچوونی دام و دەزگاکانی کاربەدەستانی ئێران و کەوتفەوەی حوکمرانانی رژێمی

سەرلێشێواوی خومێنی، بە گێژەڵۆکەیێکی سەرلێشێواویدا. .

وەك لە چەند راپۆرتێکی سوپای‌ی‌و سیاسیدا هاتووە «لەشارەزایانی سوپای‌ی‌و سیاسەتدا» کە رژێمی ئێرانی بە هەستانی لەم دواییەدا بە ئامادە کردن و هاوێشتنی ئەو ژمارە زۆرە لە سوپای مەشق کردو لەسەرء چەکی تازەو کەرەسەی جەنگ «ئەوەی کەبۆی ماوەتەوە» لە ئامێری جەنگ بەبێ سەر داپۆشی کردنی بەهێنری ئاسمانی، هەلێکی جوان و شیاوی رەخساند بۆ سوپای چەکداری عیراقی بۆ تێك و پێکدانی سوپای چەکداری تاوانباران کە ژمارەیان،چارەکە ملیۆنێك بووە بە هەمە چەشنە کەرەسەی جەنگەوە، بەتایبەت لەژێر لێدانی هەمیشەی‌ی هەڵۆ ئازاو دلێرەکانی عیراقی سەربەرزمان. . .

هەرواش دیسان وەك لە راپۆرتەکانی بێگانەکاندا هاتووە کە جەنگەکانی زەلکاوەی حوێزە «هور الحویزە» گەورەترین کۆسپ و چەمەرەو شکستێکی سوپای‌ی بووە بەگوێرەی رژێمی ئێرانی‌و بە هیچ شێوەیەك لە بیرو مێشکدا ناچێت و ناکوژێتەوە، چونکە ئەو چەشنە زیانە گەورەیە کە بە قەوارەی سوپای رژێمی ئێرانی گەیشتووە، بێگومان بووە خاڵێکی پیشەی‌ی لەسەر کوتاندنی ئەو رژێمە لە رووی سوپای‌ی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایتی‌و ئابووریەوە لە ئێراندا.

کاتێ رژێمێکی تاوانبارو دەستدرێژکار لە تەنها هێرشێکیدا پتر لە «25» هەزار کوشتار دەدات بە هەموو کەرەسەی جەنگ و تەقەمەنیەوە تەنها لە ماوەی شەش رۆژداو نەگەیشتنی بە بستێك. . بەخاڵێك لە ئەنجامی مەبەستەکانی، لە هەمان کاتدا عیراق بەو پەری توانایەوە هەمیشە بەردەوامە لەسەرکوتاندنی ئەو رژێمەو لێدانی بەرژەوەندیەکانیدا، ئایا ئەمە چی ئەگەیەنێ‌و چی‌ی پێ دەلێن!؟

ئەو پیرۆزی‌و سەرکەوتنەیە کە ئێران بەلێنی بەگەل و سوپاکەی داویەتی‌و خۆی هەلئەنێ بە خەلەتاندنیان!؟ سەرکەوتن سەرکەوتنی کێ بووە. . عیراق. . یان ئێران. . وەلامی ئەم پرسیارانە ئەبێ خوێنی بەخۆیء بیداتەوە. .

**ئایاکەی! لەکاتی سەردانیدا بە گۆرەپانەکانی جەنگ. . ئەگەر بوێری. .**

لێرەدا. . لە شی کردنەوەی ئەو راپۆرتانە بۆمان دەردەکەوێ کە عیراق لە مێژەوە چاوەروانی ئەو هێرشەی دەکردو ئاگای لێبووە. . نەك هێرشێکی ناکاوی بووە، کە ئێران بەلای خۆیەوە کەس پێی نازانی‌و ئاگای لێ نیەو نەبووە. . سەرکردایتی دلێرمان. . هۆشمەندمان. .

**بەرابەری سەرکردەی بە جەرگ**

هەڤاڵ صدام حسین لە هەموو جموجۆڵ و ئامادە بوونی ئەو رژێمە ئاگاداربووەو بەوپەری دلنیاییەوە ـ دلنیای‌ی‌ی سەرکەوتن ـ ئامادە بووە بۆ بەگژا چوونی‌و سەرکوتاندنی‌و گۆرو پێشێل کردنی هێزی سوپاکانی. . ئەوەش بەشێوەیێکی ئاشکرا دیاری دابوو لە نێو هێزە ئاسمانیەکانمان بەلێدان و سەرکوتاندنی سوپای ئامادە کراوی ئێرانی. .

شان بەشانی ئەوەش وەك دیاری‌دا بەراستی هێرشێکی براوە بوو. . چونکە ئەو چەشنە شکست هینانەی سوپای ئێرانە لەو هێرشەیدا ئەوە ئەگەیەنی کە عیراق بەتەواوی تێك و پێکی سوپاو و کەرەسەی جەنگی ئێرانی داوە، وای لە حوکمرانانی ئێرانی کردوە کە تووشی نەخۆشی شێتێکی هەمیشەی‌ی ببن «نەخۆشی هیستریا» چونکە بێ‌دەنگی‌و کربوونیان پاش هێرشەکەیان ئەوە دوپات دەکاتەوە کە لە پێشاندا بەهەزار چەشنە خۆیان هەلدەنا. .

دوا شی‌کردنەوە ئەوەیە کە عیراق توانایەکی سوپای‌ی بەرزی هەیە چ لە سەربازان و هێزەکانی. . چ لەکەرەسەی جەنگ لەنێو ئەو دوپاتکردنەدا لە بوونی کەسایتی‌و بێهاوتای‌ی لە گۆرەپانەکانی جەنگدا لە دابین کردنی سەرکەوتان لەروی تەکتیکی خۆراگرتنەوەدا. . وەنەبێ تەنها ئەوەبێت بەلکو لەوە بەرزو بلند و دیارداوەتر هەیە کە ئەوەش بیرهۆشی‌و هۆشمەندی دانەری نەخشەو پلانەکانیەتی. . کە لە نێو کەسایەتی سەرەك پێشەواوە خولقاوە. . . کەسایەتی هەڤاڵ تێکۆشەر سەرەك صدام حسین.

# لە وولاتی ئاخووندان دا

موکەڕەم ڕەشید تالەبانی

لە ئێرانی خومەینیدا
ئاخووندەکان،
بە ئاگرو گڕو ئاسن،
کوردو عەرەب،
بلووج، ئازەر..
سەردەبڕن!
بە کینەو ڕق،
سکی کۆرپەو پیرەمێردو ئافرەت و گەنج
هەڵ دەدڕن!!
گوڵی گەشی باخچەی ئاوات..
دەوەرێنن،
بزەی لێوی بووك و زاوا
دەتورێنن!!
کوڕو باوك
لە یەکتری دەکەنەوە!!
چاوی ڕووناکی کوێر دەکەن،
سەدەی ڕەشی تاریکیی ڕەش،
بۆ ناو شاری شارستانی دەبەنەوە!!
ووشەی هەموو ئازادییەك
زیندە بە چاڵی گۆڕ دەکەن!!
ڕۆشنبیریو هونەری جوان
لەبەر چاوی ئەبلەقاویی هەموو جیهان
لە سێدارەی نەزانین و کینە دەدەن!!
تینوویەتیی ڕقی هەزار ساڵەی نێو دەروونیان
بە خوێنی گەش.
خوێنی گەشی هەژاران و نەدارانی..
دێو شارەکان،
وا دەشکێن!!
کۆشکی ئومێدو ئاواتی هەموو دڵێك
لەناو باخی ژینی ڕوون دا
دەڕووخێنن!!
ئاخووندەکان...
لە ئێرانی خومەینیدا
هیچ شوێنێکی زیندوویەتی
بە زیندوویی ناهێڵنەوە!!
بگرە بەردو خاك و زیخ و چەو،
بیابان و دەشت و چیایش..
بە ئاگری ڕقی ڕەشی نێو دەروونیان
دەسووتێنن!!

★ ★ ★

لە ئێرانی خومەینیدا
ئاخووندەکان
بە ڕووالەت، بەرگی ئایین
لەبەر دەکەن!!

بانگی درۆی ئایینداری
بە گوێی خەڵکی خۆشباوەڕی ساویلکەدا
وا هەڵ دەدەن!!
جلی ڕەشی کۆن دەپۆشن،
لە مەیخانەی نەزانین دا
بە مێزەرو جبەی بۆری هەڵخەڵەتێن
بادەو پێکی مەیو شەراب
هەڵ دەنۆشن!!
تلیاك دەجوون،
لەنێو هۆڵی تیاترۆدا
سەمای مەستیی خۆیان دەکەن
خوێنی گەلی ستەم دیدەیش لەبەر دەرگای مێژووی شاردا
بەبا دەدەن!!
گۆشتی لەشی گەلان دەخۆن..
لەبەردەمی یاساکان دا.. دادەنیشن..
دەستی خوێناوییان دەشۆن!!
★ ★ ★
خاکی ئێران،
لەناو خوێنی ستەمگەریی خومەینیدا
وا ڕۆچووە،
لە ئازارو ئەشکەنجەدا
نوقوم بووە!!
لە وولاتی ئاخووندەدا
کا بۆ سەگ و
ئێسك بۆ ئەسپ.. دانراوە!!
بۆ ڕەش و رووت
گۆڕستانی لەناوبردن هەڵکەنراوە!!
لە شەقام و کووچەی بیردا
هەر خەرمانی کەللەسەری ئازادییەو
هەڵدراوە!!
خامەی بیریش، لەگەڵ پەنجەی ووشەی گەش دا
لە تەنووری زیندانیدا.. سووتێنرا وە!!

## (پەراوێزێك)

ڕۆژێك دادێت،
گشت گەلانی خاکی ئێران،
خۆ دەکەنە، گوللەو گڕو
پشکۆی گرکان،
خاکەکەیان.. کە گیرۆدەی خومەینییە
لەنێو چنگی دڕندەیی ئاخووندەکان
دەردەهێنن!!
مێشکی پووچی خومەینیی شێت
دەپژێنن!!
بێ گەڕی ناپوختەیی ئاخووندەکان..
دەڕووخێنن!!
ڕیشی پیسی ئاخووندانی سەدە تاریکەکان
دەسووتێنن!!
لەسەر زەمین..
ڕەگ و ڕیشەی پۆخڵییان دەردەهێنن،
لە ئاوێنەی مێژووی نوێدا
زوڵفی خۆری ئاشتیو ژیان
دادەهێنن!!
واتای پیرۆز
بۆ هێمنیو دۆستایەتیو هاوسایەتی
دەگێڕنەوە!!
لە سێبەری ئاواتی نوێی هەژاران دا
بزەی لێوی هەزاران دڵ
زەردەخەنەی هەزاران گوڵ
دەنەخشێنن!!
چیرۆکی ڕێی خەباتی سەخت
بۆ نەوەکان..
بۆ گەلانی هەموو جیهان
دەگێڕنەوە!!

# نامەکا جانکورەکێ کورد ژ ئێرانێ

● زیاد نقیب ●



هۆ خەلکینۆ..
دلێ منە..
ئێش وژانا
رادگریتن
رێیا ژینێ
دگوهوریتن
جان ئەسمەرا
دحەبینیتن..
دحەبینیتن.

★ ★ ★

خوینا منە..
ڤان سوور گولا دخەملینیتن
بو مێژوویێ دگرنژیتن
دبیتە روبار
پێلێت دوژوار
ڤان نەیارا
بدویر دئێخیتن..
بدویر دئێخیتن..

★ ★ ★

ڤینا منە..
بوویە هەوار
ئەڤیندارا خردکەتن
ل وەلاتی
دبنە ژڤان
کورێ قازی
دکەنە چرا
لهەمی درا
گازی دکەن
هۆ جانکورێت..
مەهاباد وسەقزو بانێ
جار چرایێ..
بکەنە ئالا
گورێت شەهیدێت راستیێ..
ل ئیرانێ..
پێ بخەملینن..
پێ بخەملینن.

★ ★ ★



# له ڕێگەی دیوانی «خانای قوبادی»دا

محەمەد عەلی قەرەداغی

گومان لەوەدا نی‌یە سەرەتای ئەدەبی کوردی ـ وەك ئەدەبی زۆربەی گەلانی جیهان ـ بە شیعر دەستی پێکردوەو، شیعرەکەیش بە گەلێ قۆناخدا تێپەڕیوە تا بە قۆناخی ئێستە گەیوە. ئاشکرایشە لەو قۆناخانەدا دەیان زاناو شاعیر شیعریان گوتوەو، هەر یەکێکیان بە پێی تواناو دەرفەتی خۆی شوێن دەستی خۆی دیاریی کردوە.

گەلێك لەو شاعیرانەیش شیعرەکانیان بە (جگەرگۆشە)ی خۆیان زانیوەو، کە دیوانیان لەو جگەرگۆشانە پێك هێناوە بە جۆرێك شانازییان بە دیوانەکەیانەوە کردوە کە خۆیان بە حاکمی سێ ئیقلیم داناوە، وەك (نالی) دەڵێت: ـ

**فارس و کوردو عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتوە**
**(نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە، دیوانی هەیە![1]**

بەڵام کە ئاوڕێك لە کتێبخانەی کوردی دەدەینەوەو بە تایبەتی بۆ دیوانی شاعیرانی (100) ساڵ و زیاتر بەر لە ئێستە دەگەڕێین و دیوانە چاپکراوەکان لەگەڵ ناوی شاعیرانی کۆندا بەراورد دەکەین، دەبینین ژمارەیەکی زۆر کەمیان بەختیان یار بوە لا لە دیوانەکانیان بکرێتەوەو بە هەر شێوەیەك بێت چاپ کرابێت. کە دوای ئەم بەراوردەیش چاوێکی دیکە بە دیوانە چاپکراوەکاندا دەگێڕین ناگەینە ئەنجامی ئەوەی بە متمانەوە بڵێین یەك شاعیری کۆنمان هەیە دیوانەکەی ـ یان بەشی هەرەزۆری دیوانەکەی ـ چنگ کەوتوەو چاپ کراوە.

ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو شاعیرانەی تا ئێستە دیوانیان چاپ نەکراوە کۆڵکە شاعیر بوون و، یان هەر دیوانیان نەبوە، یان دیوانەکانیان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، بمانەوێ نموونە بۆ ئەم بابەتە بهێنینەوە بۆ شاعیر دانامێنین و، بگرە شاعیرەکان لەوەیش زۆرترن لێرەدا باسیان بکەین.

دەمەوێت لەم وتارەدا لا لە نموونەیەك لەو شاعیرانە بکەمەوەو بەس. ئەو نموونەیش شاعیری بەرزو ناوداری کورد (خانای قوبادی)ی خاوەنی شاکاری (شیرین و خوسرەو)ە. ئەم شاعیرە مەزنەمان کە دانەری ئەو یادگارە مەزنە بێت و سواری مەیدانی وشەی شیرین و، هەوڵ و کۆششی فەرهادیی بێت چۆن دەگونجێت دەیان پارچە شیعری بەرزو ناسکی نەبێ؟

خۆشبەختانە بەش بەحاڵی خۆم توانیومە لە پێناوی کۆکردنەوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرەدا چەند هەنگاوێکی باش بنێم و، لە هەر سووچ و قوشبنێکدا پارچەشیعرێکم

دیبێت نووسیومەتەوەو لە هەل و دەرفەتی گونجاودا بڵاوم کردوەتەوە. دیاریی ئەم جارەیشم دوو پارچە شیعری ئەم شاعیرە مەزنەیە کە - من پێ بزانم - تا ئێستە بڵاونەکراونەتەوەو دەیانخەمە رزی شیعرە بڵاکراوەکانی، بەڵکو لە هەل و مەرجێکی دیکەدا وەك دیوانێکی نەشمیلەو یادگارێکی دیکەی ئەم شاعیرە مەزنە چاوی خوێنەرانی کوردی پێ روون بکەینەوە.

دەبێ لێرەدا پەنجە بۆ تەنگوچەڵەمەیەکی رێگەی کاری کۆکردنەوەی بەرهەمی شاعیرانی کورد رابکێشین: هەر نووسەرێکی کورد بیەوێ دەست بداتە کۆکردنەوەی شیعری شاعیرێکی کورد یەکەم هەنگاو رووبەڕووی ئەوە دەبێتەوە کە شیعری شاعیرانمان لە دوو دەریای بێپەیدا پرژ و بڵاون و، مەلەوانێکی زۆر بە پشووی ئەو مەیدانە نەبێ ناتوانێ شتێکیان لێ دەربهێنێ.

**دەریای یەکەم:** دەریای بەیازو کەشکۆڵی شاعیران و، قەراخ و بیجاخی دەستنووسە کۆنەکانە، کە شیعری شاعیرانیان بێ رێبازو نەخشەیەکی پەیرەوکراو تێدا نووسراوەو، هەروەها ئەو بەیازو کەشکۆڵانە خۆیشیان لای ئەم و ئەوو لە کتێبخانە شەخسیی و تایبەتییەکاندا بە هەمان شێوەو زیاتریش بێ رێبازو نەخشە پرژ وبڵاون و، نووسەر هەزار هەوڵ و تەقالا دەدات و دەیان تکاکارو واسیطە دەدۆزێتەوە هێشتا ناتوانێ بەشێکی کەمی ئەو کەشکۆڵ و بەیازانە ببینێ و سوودیان لێ وەربگرێت.

**دەریای دووەم:** رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانە، لە دەرچوونی یەکەم رۆژنامەی کوردییەوە نووسەرانی کورد دڵیان بە ئەدەبی کوردی سووتاوەو کە نەیانتوانیوە دیوانی شاعیرانم چاپ بکەن هەوڵیان داوە ناوبەناو پارچە پارچە شیعری کەڵە شاعیرانی کورد لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکان چاپ بکەن و بەشێك لە ئاواتی خۆیان بێننە دی و چەردەیەکیش لە قەرزی خۆیان بەرابەر بەو شاعیرانە بدەنەوە، بۆیە هەر لە: کوردستان و، ژین و، لا ژیان و، ژیانەوەو، هەتاوو، گەلاوێژ و، دەنگی گێتی تازەو. . تا دەگاتە: بەیان و کاروان و، رۆژی کوردستان و، هاوکاری و، عیراق و. . تاد بە دەگمەن ژمارەیەکمان دەست دەکەوێت شیعری شاعیرێ یان چەند شاعیرێکی تێدا نەبێت.

ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەیش لە لایەکەوە بیبلۆگرافیایان بۆ نەکراوە تا نووسەر بتوانێ بە ئاسانی شوێنی مەبەستی خۆی بدۆزێتەوەو، دوایی بە چاوڕوونی و شارەزاییەوە بۆی بچێ. لە لایەکی دیکەیشەوە بەشێکی زۆری ئەو گۆڤارو رۆژنامانە - بەتایبەتی کۆنەکانیان - لە کتێبخانە گشتییەکانیشدا، نەك لای زۆر کەس، دەست ناکەون.

ئاشکرایشە ئەو نووسەرەی دەیەوێت بەرهەمی شاعیرێك کۆ بکاتەوە رووبەڕووی ئەم هەموو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمە دەبێتەوەو، ئەگەر بیر لە ئاڵۆزیی و جەنجاڵی ئەم هەموو کۆسپ و تەگەرە بکەینەوە دەتوانین بڵێین: نیمانە بتوانێ بگاتە ئامانجی خۆی و، کارەکەی یەکسەرە بکاتەوەو، رێگەی ئەوە نەهێڵێتەوە دوای خۆی کەس لە پەرێزیدا گوڵچنی بکات. هەر لەبەر ئەمەیشە من لە عاستی خۆمەوە کە لە بەرهەمێکی بڵاونەکراوەی شاعیرێك دەدوێم دەڵێم: «من پێ بزانم» یان «بە گوێرەی ئاگاداریی من» ئەو پارچە شیعرە بڵاونەکراوەتەوە.

لەم روانگەیشەوە پێشنیاری ئەوە دەکەم: هەرکاتێ نووسەرانمان ویستیان بەرهەمی شاعیرێك بڵاوبکەنەوە لە پێشدا ئاورێك لەم مەیدانە بدەنەوەو دوایی ئەرك و رەنج و کۆشش و تەجرەبەیان پێش چاوی خوێنەرانی دیکە بخەن، بەم چەشنە دەتوانین هەندێك لە ئاڵۆزیی و نابارێی ئەم مەیدانە کەم بکەینەوە، بۆ نموونە من کە باسی (خانای قوبادی) دەکەم دوای کۆشش و گەڕان چەند سەرچاوەم دۆزییەوە باس لە خانا بکەن هەموویان بنووسم، یەکێکی دیکە کە دەربارەی (میرزا شەفیع)، یان (ئەحمەد بەگی کۆماسی) یان. . ی نووسی هەمان رێباز بگرێتە بەر، لەم رووەوە دەتوانرێ وردە وردە زەمینەی کۆکردنەوەی بەرهەمی شاعیران خۆش بکرێ و، کات و کۆششی کەسانی دیکەیش

بۆ کارگەلی دیکە ئاراستە بکرێ.

وا لێرەدا ئەو سەرچاوانەی باس لە خانا دەکەن و من دەستم پێیان گەییوەو پێم زانیون تۆمار دەکەم:

1 ـ شیرین و خوسرەو. محەمەدی مەلاکەریم، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد بەغدا.

2 ـ گوڵ گەشتێك بە مێرغوزاری خانای قوبادیدا، رەئووفی ئەحمەد ئالانی، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی. 1979.

3 ـ رۆژنامەی ژین، ژمارەکانی: 1268و 1358.

4 ـ دەنگی گێتی تازە. ژ: 3. س: 3. ل: 226.

5 ـ بەیان. ژ: 28. ئابی 1975.

6 ـ هاوکاری، ژ: 412، 1978/2/6.

7 ـ هاوکاری، ژ: 452، 1978/12/11.

8 ـ کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی بەرگی: 1و 2.

لەم دەرفەتەیشدا دەمەوێ سواڵەیەکی دیکە بخەمە سەر خەرمانی شیعری خانا. لەم ماوەیەدا سێ دەستنووسی خوالێخۆش بوو رەشید هەمەوەندم دەست کەوت،[2] لە ناو یەکێك لەو دەستنووسانەدا دوو پارچە شیعری خانای قوبادی تێدایە، گەران و پشکنین ـ وەك گوتم ـ هاتمە سەر ئەوە ـ بەپێی ئاگاداری من ـ تا ئێستە بلاونەکرابنەوە، بۆیە لێرەدا پێشکەشیان دەکەم.

ئەم شیعرانە لە نێوان دوو کتێبدا نووسراون و، بە خەتی رەشید هەمەوەند نین و، وا دیارە خەتی دوو کەسی دیکە بن، هەرچەند خەتەکە خۆش خوێنە، بەلام نووسەرەکان کۆلکە خوێندەوارن و هەڵەی زۆر زەقیان لە نووسینەوەکەدا کردووە ئێمەیش هەڵە زەقەکانمان چاك کرد.

دەبێ ئەوەیش بڵێم: ئەگەر وەك پێویست لەسەر هەموو ناوو باسەکانی ناو شیعرەکان بنووسم دەبێ ئەوەندە بنووسم کە لێرەدا جێگەی نەبێتەوە، چونکە ـ وەك دەبینی ـ ناوی ناوداران و، پێغەمەران و، گەلێ شتی وەهای نووسیوە کە هەر یەکەیان ئەندازێکی باشی لەسەرنووسین دەوێت. لەم هەنگاوەدا دەمانەوێ شیعرەکان زیندوو بکەینەوە، با ئەو باس و خواستە بۆ کات و هەلی خۆی هەڵگرین.

ـ 1 ـ

گومرای سەرنگوون. . . . . . .
گومرای بێخەبەر! گومرای سەرنگوون!
شەوو رۆ نە فیکر جۆیای دنیای دوون
غافڵ جە کردەی کارساز بێچوون
وێنەی وەریان ئەولاد ئادەم
وەکۆ شین بەرشین جە دنیای ماتەم؟
کوانێ مورسەلان شەریف کەردەی حەق؟
کۆن مەشایخان صوب خێز شەفەق؟
کوانێ ئیمامان رەهبەر نە رای دین؟
کۆن (مووسا)ی کەلیم گوزیدەی یەقین؟
کۆن رەنگە رەونەق (یوسف) کەنعان؟
کۆن دیوان دێو حوکم (سولەیمان)؟
کۆن (شوعەیب)و (شیث) (عیسا)ی بن (مەریەم)؟
کۆن (خلیل الله)، (جەرجیس)و (ئادەم)؟
کۆن صەدای تەکبیر نەعرەتەی (حەیدەر)؟
کوانێ (ذو الفقار) برندەی دووسەر
کۆن نام و نیشان (ئەحمەد)و (مەحموود)
کۆن (نور)[3] صەدای صوب نەغمەی (داود)
کۆن (حەسەن، حوسەین) ئال (پێغەمبەر)؟
کۆن چوار یاران رەسوول سەروەر؟
کۆن تیپ قەوشەن ئەصحابان تەمام؟
کۆن (حەمزە)و (عەبباس) بەوران نێك نام؟
کۆن پیران پیر دانای (ذو الجلال)؟
کۆن سوار غەیب (وەیس یەمەن) ماڵ؟
کۆن موصەننیفان عیلم شەریعەت؟
کۆن ئەولیائان دەریای حەقیقەت؟

کۆن شان و شەوکەت (عەبدوڵڵا)و (عومەر)؟
کۆن تاج (لولاك) ڕەهنومای ڕەهبەر؟
کۆن (ئیمام قاسم) میر تورکستان؟
کوانێ (بایەزید) قوطب ڕووی جیهان؟
کۆن (عەبدولمەناف) چەنی (عز الید)؟[4]
کۆن (ئەباسەعید)، (خالید بن ولید)؟
کوانێ ئینس و جین نە ڕووی سەرزەمین؟
کۆن پەهلەوانان سام سەهمگین؟
کۆن (زاڵ)و (رۆستەم) (بەهرام) گۆڕگیر؟
ساکۆن (کەیکاوس) پادشای دلێر؟
کۆن باهووی بەرز (فەرامورز) شێر؟
کوانێ (جیهان بەخش) ئەژدیهای دلێر؟
کۆن (برزوو)و (طەیموور) چەنی (ڕۆبیتەن)؟
کۆن نەققاشیی (فەرهاد) کۆکەن؟
ساکۆن لەشکر گەوران مەلموون؟
کوانێ (موعتەصەم)؟ کۆن دەستگای (قا روون)؟
کۆن (فیرعەون) مکەرد دەعوای خودایی؟
کۆن (قاروون) غەرق گەنج دنیایی؟
کۆن مولك و ئەملاك بازاڕ (نەمروود)؟
کۆن تاج و تۆمار (شەدداد) مەردوود؟
کۆن نەظم (جامی) دوڕڕ صەدەف ڕێز؟
کۆن مەولای[5] ڕۆمی؟ کۆن شەمس تەبریز؟
یەکسەر کۆچکەردەن شین وە جای موقیم:
نیم ئەهل بەهەشت، نیم نار جەحیم
بەعزێ گیر بە دەست ئاهیر سۆزەن
بەعزێ جەمینش (کڕان)[6] نەوروزەن
بەعزێ سۆزانەن سەرتاپا قەدەم
بەعزێ دڵ گوشاد ئەو نەدارۆ غەم
بەعزێ شەرمەسار کردار وێشەن
ڕۆی (یوم الممات) هەرکەس بەوێشەن
بەعزێ رووگەردان ڕۆی قیامەتەن
بەعزێ مەسکەنش ماوای جەننەتەن
بەعزێ گرفتار عەذاب سەختەن
بەعزێ سەرئەفراز شاه سەرسەختەن
بەعزێ بێقەرار دیدە نمینەن
بەعزێ نائومێد ئیمان و دینەن
بەعزێ مپۆشان جە حوللەی حەریر
بەعزێ موقەڕڕەب پادشای کەبیر
بەعزێ منۆشان جە حەوض کەوثەر
بەعزێ ساکینەن جە قوبەی ئەحمەر
بەعزێ ئینتیظار لوطف حەمیدەن
بەعزێشان مەشغوول ذیکرو تەوحیدەن
بەعزێ عەیشش چەنی حۆرییان
بەعزێ فاریغەن جە رەوضەی ریضوان
بەعزێ ملەرزۆ جە خەوف صیراط
بەعزێ مرێزۆ ئەسرین چون سەیلات
بەعزێ مکێشۆ هەر دەم ئاهـ سەرد
بەعزێ بە عەموود مکەرداش بە گەرد
هەر یەند مناڵان مکەران زاریی
فێشتەر دەردشان پێ مبۆ کاریی
دڵە بزانە ئینە وەعظتەن
تۆ پەی چی [چون یانە سزای سختن][7]
ساگیرە نە گۆش پەندو نەصیحەت
ویر دە وە کردار کەسب ئاخیرەت

- 2 -

دنیای مەکارە!
دنیای حیلەباز[8] کۆنەی مەکارە!
موطریب مووکەش،[9] مەیبەخش مەستان
زەوال ساکین زوور زەبردەستان
شووم شەڕ، ئاشووب، شیت ظوڵمات شەو
مینای صەف شکەن! ساختەی کۆژەی نەو
نەرراد نەردباز نەرد بەد کەندە!
شا جە تەخت ئەنداز، غولام بەرگەندە!

چەنی کەس تا سەر دۆستیی نەکەردە
بێ شەرت و بێشۆن کەس چار نەبەردە!
جەللاد قاتیل! رەهزەن راهان!
فەرق نەکەردەی کەس گەدا تا شاهان!
عەجووزەی بێ شەرت شووم شەرئەنگێز!
عەرووس ساحیر خوون دامان رێز!
ئەرێ هەی دنیا جە شیراز تا شام
جە قاف تا بە قاف کێت ناوەرد بە دام؟
جە کەیخوسرەوان کێت نەفرێونان؟
کەوکەبەی دیوان کێت نەشێونان؟
کێ بی تا وەسەر نامداریت کەرد؟
کێ بی تا وەسەر میوەی باخت وەرد؟
سیاهیی وە ماڵ کێدا نەشەندی؟
تەخت و بەخت جە دەست کام شا نەسەندی؟
وە کێ نەشانای مەودای قەبزەی تێغ؟
بنچینەی ئەولاد کێت ناوەرد جە بێغ؟
چەنی کێ تا سەر ئاخر ئاوەردی؟
کێ داخڵ وە شار خامۆش نەکەردی؟
چەنی گشت عالەم شمشێر بازیت کەرد
ئەوەڵ تا ئاخر دەست ئەندازیت کەرد
بە کێ نەنمانای زەوق جوانیی؟
بە کێ ناوەردی شاد پەشیمانیی؟
گەنج داران شاد بین وە گەنج وێشان
جام بادەی مەوت تۆ نۆشای پێشان

★ ★ ★

جە نام ئاوەران شاهان ماضیی
بە حیلەسازیی کێت نەدا بازیی؟
جە شا تا قەیصەر، جە قەیصەر تا میر
قەبزەی مەرگە نە فەرق کێ نەکەردی گیر؟
جە پێشانیان تا کەیانیان
جە ئەشکانیان تا ساسانیان
یەکایەك خەرقەی رای نیهان پۆشان
بەردت وە ماوای شار خامۆشان
(کێو مرث) کەی بەو کردگارەوە
(تەهموورث)شا بەو بەزم باز شکارەوە
شا (جەمشید) بەو ذەوق نۆشای بادەوە
فەرەیدوون (. . .)[10] رۆی ئەییامەوە
(سەلم و طوور) بەو سان بێ شومارەوە
(مەنۆچەهر) بەو قین خەشم و قارەوە
(ئەفراسیاب) بەو سان تیپ و سوپاوە
(کەیخوسرەو) بەو تاج زینەت نماوە
(کەیقوباد) بەو تیپ بەزم و رەزمەوە
(قەهرەمان) بەو قین قەصت[11] جەزمەوە
(ضەحاك) بەو غەضەب جەفاو جەورەوە
(کەیکاوس) بەو عەیش تەرزو طەورەوە
(هۆشەنگ) بەو شاهیی رووی جیهانەوە
(توهمەتەن) بەو گورز بەو کەمانەوە
چەند شاهان جە تەخت ئاوەردش بە وار
چەند پەهلەوانان کەردش نگوونسار
(دەقیانووس) بەو گەنج خاك نیهادەوە
بەو ذەوق مەجلیس نۆشای بادەوە
کوا صەدای طەپڵ کوس کەیانان کەی؟
کوانێ بەیداخان شنەوای دەشت رەی؟
چەرخ دنیای دوون دەوەندەی دەوران
کوشندەی شێران سەرکەندی بەوران
یەکایەك بادەی جام تۆ نۆشان
بەردی وە ماوای شار خامۆشان

★ ★ ★

(حاتەم) بەو سەخای کەرەم کەردەوە
(لوقمان) بەو شیفای[12] دەوای دەردەوە
(هۆشەنگ شا) بەو پەر بازوو بەندەوە
(سیاوەحش) بەو هوون دەعوامەندەوە
(گوشتاسپ) بەو بەزم دەنگ دلێرەوە

(ئەردەشێر) بەو چنگ پەنجەی شێرەوە
(سوهراب) بەو بەزم بێ‌سوود کەردەوە
ئەویش بەو دەعوای رۆی نەبەردەوە
یەکایەك بادەی جام تۆ نۆشان
بەردت وە ماوای شار خامۆشان

★ ★ ★

(بەهمەن) بەو بازووی زۆرو زاتەوە
(دارا) بەو دارای حوکووماتەوە
(ئەسفەندیار) بەو دەعوای شۆرو شەرەوە
(فەیلەقووس) بەو گەنج (بیضەء)[13] زەرەوە
(ئەسکەندەر) بەو فەتح جیهان کەردەوە
بەو سەدد بەستەی نام ئاوەردەوە
(بەهرام) بەو شەوکەت ئارای رەزمەوە
بەو ئینشائی مەشهوور نەثرو نەظمەوە
(نەوشیروان) بەو عەدل کەس نەدارەوە
(خوسرەو) بەو طەلای دەست ئەفشارەوە
(شاپوور) بەو شاهیی نام ئاوەزەوە
بەو موطیعی دین پێغەمەرەوە
(ئەردەشێر) بەو هەیبەت سوپاو سانەوە
بەو ئیقلیم گیریی رووی ئەییامەوە (!)
(سام نەریمان) بەو سوپەرەوە
(زاڵ) زنجیربەر بەو هونەرەوە
(چەنگیزخان) بەو چنگ غەضەب بەندەوە
ئەو شاهیی جە دەست شاهان سەندەوە
(زەوارە) بەو زۆر کەف مشتەوە
چەند پەهلەوانان بە زۆر کوشتەوە
(فلامەرز)یەن بەو سوپەرەوە
(جیهان بەخش) بەو هەیبەت خیرەسەرەوە (!)
(تەیموور) بەو کەمان بەو تیرو سوپەر
دوشمن جە دەستش نمەشی وە بەر
(جیهان گیر) یەن مەرد دلاوەر
جە مەعرەکەو جەنگ بە وێنەی ئەژدەر
یەکا یەك خەرقەی رای نیهان پۆشان
بەردت وە ماوای شار خامۆشان

★ ★ ★

داستان ئانی: پێغەمەران گشت
نەبی‌و، مورسەلان جوملە دای بە کوشت
ئەوەڵ کە (ئادەم صفی الله)بی
(شیت) چەنی (ئیدریس) )(نوح) دەریایێ
هەم (صالح)، هەم (هوود)، (ئیبراهیم) خەلیل
رازیی بی وە ذەبح قۆچ (ئیسماعیل)
(ئیسحاق)و (یەعقووب)، (عیسا) هەم (أسباط)
(یوسف)و (شوعەیب) سیرر غەیب جە لات
گوستاخیی (مووسا) رەشیدیی (هاروون)
(یوشع) چەنی (نوون) (ئەییوب)و (شەمعوون)
(هوود)و (دانیال) (ئەرمیا)و (حیزقیل)
(ئیلیاس) چەنی (خضر)و (ذالکفیل)
(یونس) و (داود) حوکم (سولەیمان)
رەم کرد ئینس و چەند بسەندش دێوان
(جەرجیس)و (شەمعوون)، (عوزەیز) ئەعظەم
(یەحیا)و (زەکەریا). (عیسی بن مریم)
تا هەجر خاتەم خەتم پێغەمەر
یەعنی محەممەد شافیع مەحشەر
یەکایەك بادەی جام تۆ نۆشان
بەردت وە ماوای شار خامۆشان

★ ★ ★

کوا خان و، سوڵطان، میرو بەگلەران؟
کوانێ غولامان؟ کوا خدمەتکاران؟
کوا چابوك سواران جە عەرصەی مەیدان؟
هەی (میکرد)[14] وە ئەسپ بەحری نەژادان
کوا (فەرهاد) چین کەندەی بێستوون؟

جه عەشق (شیرین) وێش کەردەن زەبوون
کوانێ (زلێخا) گەردن شووشەی زەر؟
جەمین قورص خۆر باڵا چون عەرعەر
کوا جوانیی شیرین شۆخ ئەرمەنیی؟
کوانێ (خەرامان) نازدار چینیی؟
کوانێ (هومەیلا) (لەیلای عامیریی)؟
ئەبرۆ چون کەمان، زوڵفان عەمەریی[15]
یەکایەك دنیا! بادەی تۆ نۆشان
بەردی وە ماوای شار خامۆشان

★ ★ ★

ئەرێ هەی دنیا دەنی بێ حەیا
چەنی هیچ کامیان نەکردی وەفا
هەمیشە خەریك ئەفسوون بازیی بی
پەی فەوت یاران دایم خەریك بی
کوانێ تیجاران صاحیب قەتاران
دایم نە گەردش پەی بەهای شاران؟
کوا بازرگانان صاحیب مەتای چین؟
کوا دوکان داران پڕ ئەشیای رەنگین؟
کوا عاقڵ مەندان پڕ عەقڵ و تەدبیر؟
کوا میرشکاران دەوەندەی نەخچیر؟
کوا نەوجەوانان سەرمەست و مەدهۆش؟
جه عەشق وێشان دایم دڵ وە جۆش
کوانێ میعماران نادیرەی دەوران؟
مەکەرەن تەمام قەصرو ئەیوانان
کوا نەجارباشیی سەرباشقەی نەجار؟
مەکەردش تەمام ئەیوانی تەلار
وە دایم خەریك دنیابازیی بین
کەس وە موڵك وێش رازیی نمەبین
پەی ماڵ دنیا تەلاش مەکەردن
تا سەر وە سەرای ئەڵحەد سپەردن
کەس دڵ شاد نەکا وەو دنیای فانی
دۆست کەس نیە ئەو جه نەهانی
(خانا) جه داخی دنیای پڕ ئەفسوون
دایم غەمبارەن رەنگ زەردو زەبوون
یەقین ئەی دنیایش وە باد صەرصەر
مەشۆ وە فەنا ئەمپەر تا ئەوپەر
گشت مەبۆ وە گەرد مەشۆ وە سەما
بە ئەمر مەعبود حەیی بێ هەمتا
(باقی والسلام) ئەمجار کۆتا بی
صەلات و سەلام بەر محەممەد بی

پەراوێزو سەرچاوەکان:

(1) بڕوانە: مەلا عبدالکریمی مدرس، دیوانی نالی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976، ل: 577.

(2) وتارێکی دیکەم لەسەر ئەم دەسخەتانە نووسیوەو باسی دەسخەتەکانی تێدایەو، بە هیوام رووناکیی ببینێ.

(3) ئەم وشەم وەك خۆی روونووس کرد، چونکە ماناکەی نەختێك جۆر نیە.

(4) ئەم وشەیشم بۆ نەخوێنرایەوە.

(5) لێرەدا (مەلای) نووسرابوو ئاشکرایە کە هەڵەیەو ئێمە کردمان بە (مەولای).

(6) ئەمەیش هەروا نووسراوەو رەنگە (گران) بێ، بەڵام دیسان باش ناڕوات.

(7) ئەمەیشم وەك خۆی رونووس کرد، چونکە ماناکەی نازانم.

(8) لێرەدا (حلّە ـ حیللە) نووسرابوو دیارە هەڵەیە.

(9) ئەمە رەنگە (موغ کێش) بێت.

(10) لێرەدا وشەیێکم بۆ نەخوێنرایەوە.

(11) قەصت = قەصد.

(12) (شیفای) ئەگەر (شیفاو) بێت باشترە.

(13) (بیضەء): رەنگە مەبەستی (أبیض) سپیی بێت، وەك دەیشگونجێ مەبەستی بەیضەوی = هێلکەیی بێت.

(14) (میکرد) رەنگە (مەکەرد) بێت.

(15) عەمەریی = عەمبەریی.

# کاری نامۆبوون لە شیعرەکانی نالی ـ دا



ـ ئومێد ئاشنا ـ

«بەشی دووەم»

**بەشی یەکەم لەژمارە (91) ئەم گۆڤارەدا بڵاوبۆتەوە**

لە کتێبی دیـوانی نالی‌دا کە بەبـاشتـرین و بەنـرخ ترین سەرچاوە دادەنرێت بۆ تەماشاکردن و وردبوونەوە لە شیعری نالی لەپێشـەکی شیعـرەکـاندا گەلێك هەوڵدان و لێکۆڵینەوە ئەنجـام دراوەو نووســراوە یەکێـك لەوانـە بەنـاوی ئەدەبی بێگانەیە، لەوێدا ئەگەرچی دەبوایە زیاتر نووسینەکە پەرەی پێ بــدرایــەو قوڵتــر بۆ ڕۆشنبیــری نالی بچـوایـە، بەڵام لەڕاستیـدا دادەنـرێت بەدەرگـایـەك بۆچـونـە ناو جیهانێکی نوێوە لە شیــعــری ـ نالــی ـ دا وە بۆ زۆری وەك من ڕونـاکیـەکی سەرەتـاییـە کە گەلێ لایـەن و قوژبنی تاریـك ڕۆشن دەکاتەوەو لە بنی دەریاری شیعری نالی‌دا دەکەوینە هەوڵـدان بۆ بەدەست هێنـانی ئەو گەهـەرو مرواریـانەی کە تەنهــا نالی توانیـویـەتی بیخـولقێنێ و نەخش کاری دەستی وەستایەتی خۆی تێدا بنوێنێ ڕۆشنبیری نالی قوڵ بونەوەی شیعـرەکـانیـدا دەردەکەوێت و ئێمە پشت بە شیعرەکانی بەم چەند خاڵە دەست نیشانی دەکەین:ـ

1 ـ زانستی ئەستێرەناسی، واتە فەلـسەفەی زانستی (فەلەك)

2 ـ زانستی بەلاغەتی زمانی عەرەبی بەهەموولقەکان و بەشە سەرەکی و لاوەکیەکانیەوە.

3 ـ شارەزایی لە مێـژوی کۆنی سـەردەمـەکـان و مێژوی کوردو مێژووی کۆنی ئاینی ئیسلام.

4 ـ ئاگـاداربـوون لەزانستی جوگـرافیاو بەکارهێنانی ئەو واتایانەی سەر بە ئەم زانـستەن.

5 ـ ئاگاداربوون وزانینی زانستی فیزیا.

6 ـ شارەزایی لە ئاوازو جۆری مەقـامــات کاتێ باسی مقامەکانی حیجازو موخالیف و نەوا دەکات.

7 ـ سوارچاکی لەمەیدانی بەکارهێنانی وشەی کوردی و

وردەکاری لە هۆنینەوەو ڕێك خستنی شیعردا.

8 ـ تێکەڵ بوون لەگەڵ ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی شام و تورکیا، وە هەڵس وکەوتنی ڕۆژانەی لە کۆمەڵی تازەپێگەیشتوی ئەو سەردەمەی تورکیا بەهۆی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیو پەیوەندی نزیکی تورکیاو ئەورووپا. دیارە کە ئەمە هەتا چ ڕادەیەك دەوڵەمەندیان کردوە بە سامانی ڕۆشنبیری.

9 ـ ڕۆشنبیریی بەرفراوانی خۆی لەوەی هەر لەسەردەمی فەقێیەتیەوە وئەوەی لە حوجرەداو لای مەلا بەناوبانگەکانی ئەو کاتە فێری بوە بێگومان ئەم هەر بەو ڕۆشنبیریە تەقلیدیەوە نەوەستاو هەولێ تاکە کەسی خۆی لەزۆر مەلای تێپەڕاندوەو لەبواری بەلاغەتی زمانی عەرەبی وشەرع و زانستی ـ کەلام ـ ئوسولێ دین و . . . هتد

10 ـ شارەزایی تەواوی لە نهێنیەکانی زمان و ئەدەبی کوردیو فارسیو تورکی. ئەمە جگە لەو زیرەکیو بلیمەتیە خۆرسك و سروشتیەی خۆی لەخۆیدا لە وجودی ـ نالی ـ دا خولقابوو. وەڕۆژ بەڕۆژ پەرەی دەسەند.

ئنجا ئەم دە خاڵەی سەبارەت بەڕۆشنبیریی نالی دەست نیشانمان کرد ڕاستی ئەم زانیاریە نوێیەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە لەم دواییەدانووسەر ـ هۆشەنگ ـ لەڕۆژنامەی ـ هاوکاری ـ دابەر چاوی خستین. بەشێك لەو نووسینە بەم جۆرەیە «کاتێ لە ئەستەموڵ زانرا ـ نالی ـ مردوە کوردەکان و ناسیاو وبرادەرانی پێوەی چوون و لە چاوەڕوانی شتنیو کفن کردنیا بەبن درەختەکانی باخی ماڵەکەیا بڵاو بوبونەوە لەپڕ بەکڵپەیئاگرێکیان زانی لەو لای حەوشەکەوە بەرز ئەبوەوە ژنەکەی نالی، بەدیاریەوە ئاگرەکەی خۆش ئەکا، بەدەم هەنسکی گریانەوە پەڕاوو پەڕەکاعەز ئەسوتێنێ.

کاتێ چون بەلایەوە ئەیوت ـ لەپاش ئەفەندی کەسیتر لایقی خوێندنەوەی ئەمانە نیە بۆیە ئەیان سووتێنم و چاویشم بەرایی نایە بیان بینم. گوایە ئەوە هەموو بەرهەمەکانی نالی بووە کە بەلای خۆیەوە ماوەو هەتا بەوە ئەزانن کار لەکار ترازاوەو بە سووتان کەڵکی لێبڕیون هەر ئەو کۆڕە گێڕایانەوە کە لە ناو ئەو سوتاوانەدا پەڕاوێکی ـ ریاضیات ـ ی هەرە بەرزو پەڕاوێکی ـ فیزیا ـ ی هەرەقوڵ کە هەردوکیان بەکوردی بوون لەگەڵ هەڵبەستەکانیدا وەك لەدواترا پێیان زانیوە. چونکە هەتا هێزی تیا بووە لەدانشکەدەی ئەستەموڵدا مامۆستای ـ ئەدەب ـ و ـ ریاضیات ـ و ـ فیزیا ـ بووەو پاشتر بەمانگانەی خانەنشینی ژیاوە. هەر لەو دانیشتنەمدا لەوانەم بیست کە نالی بەهۆی فیزیا زانی خۆیەوە دووشتی لە خانوەکەی خۆیدا دروست کردوە لە ئەستەموڵ. یەکەم بەئەوەی درەنگە لە دەرگاو پەنجەرەکانی خانوەکەی کەوتبێ هێزێکی کارەبایی لێداوەو (دوەم)، ژوورێکی خانوەکەی لە ناوەوە زستانان چینکۆپۆش کردوە کە بەهۆی زانستی فیزیاوە ئەو چینکۆیە گەرم بوەو ژوورەکەی گەرم کردونەوەو پێویستی بەئاگر تێ بردن نەبوە» کە واتە زانیاریو زانستی ناو شیعرەکانی نالی ڕاستی ئەم نووسینەمان بۆ دیاری دەکات. بەڵام بەداخەوە ئێمە جگە لە شیعر تەنها شیعر نەبێت هیچ نووسین و کتێب و یاداشتێکی ئەم مرۆڤە زاناو گەورەیەمان لە لا نییە هەتا زیاتر ئاسۆی تەماویمان ڕۆشن بکردایەوەو باشتر بەڵگەی بلیمەتیو زانایيو شاعیریی نالیمان لەدەست خۆماندا هەڵ بگرتایەو تێکەڵ بە جیهانە سیحریو بێئەندازە قوڵ و پان و بەرینەکەی بکردایە. ئایا ئێمە لێرەدا ناتوانین لە خۆمان بپرسین و بڵێین ئەو ژنەی نالی کە تورك بوەو زاناو شاعیرێکی هەست ناسکی وەك نالی ژیانی لە گەڵ بەسەر بردوە ئایا ئەو بەرهەمە زانستیانەی نالی بۆ سووتاندوە؟! ئاخۆ تەنها لەبەر ئەو قسەیە بوو بێ کە خۆی وتویەتی دوای ئەفەندی نارەوایە کەس بەرهەمی ببینێو خۆیشی چاوی بەرایی نایە ئەو پارچە زێڕو گەوهەری شەوچراخانە ببینێ؟! لە وەڵامدا دەڵێم «ئەو ژنەی نالی تورك بوەو هیچ بەڵگەو ساخ کردنەوەیە کمان لە لا نیە کە کورد بووبێ یاخود حەبیبەی ماڵیاوایی بووبێ وە من بۆ چونی ـ پیرەمێردی نەمر ـ پەسەند دەکەم کە دەڵێت «لە نەزەرمندا حەتتا حەبیبەی ماڵیاواش شەخسیەتێکی حەقیقی

نەبوەو تەنها ڕەمزێکە حەزرەتی نالی کردویە بەواسیتەی ئیزهاری دەهای شاعیرانەی»(2)

لەپاش ئەمە نالی بەو هەموو پێش بینیو وریایی و زیرەکیەی خۆیەوە ئایا پێش بینی ئەوەی نەکردوە کە ئەو بەرهەمە زانستیانەی هەر وەك شیعرەکانی دەبنە سامانێکی بێهامتا بۆ سامانی کەم دەستی زانستی نەتەوەکەی و سووربوون لەسەر وەسیەت کردن بۆ ژنەکەی کە بیان پارێزێو نەیانفەوتێنێ؟! ئەوا گریمان لە ژنەش دڵنیا نەبووەو هەستی بە جۆرە بیرێکی خراپ کاری ئەو کردبێ دەرهەق بە کوردو زمانیو سامانی ڕۆشنبیری کورد. بەڵام ئێمە لەوە دڵنیاین زانای گەورە ـ مەلا خدر ئەفەندی نالی ـ مامۆستای دەرسی ئەدەب و ریاضیات و فیزیای زانکۆی ئەستەموڵ هاوڕێو دۆست و خۆشەویستانی کوردی هەبوون و دەیتوانی کارێ بکات کە ئێمە ئێستا هەناسەی سارد هەڵنەکێشین بۆ ئەو بەرهەمانە. بەهەر حال ئەم مەسەلەیە خۆی لەخۆیدا کارەسات و زیانێکی گەورە بوە لە سامانی ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد. وەلەوەش هیوا براونین کەڕۆژێك لە ڕۆژان لەلایەکەوە چ ئەم بەرهەمانەی نالی وە چە تری سەرهەڵ بداتەوەو ڕۆژگار چۆنی لێون کردوین ئەوهاش بۆمان بدۆزێتەوە. وە لە بەشی یەکەمی ئەم نوسینەشدا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە دکتۆر مارف خەزنەدار ڕوونیکردۆتەوە سەبارەت بەوەی چەند ڕۆشنبیرێکی کورد پاش کۆچی دوایی نالی دەچنە لای ژنەکەی بۆ بەرهەم و شیعری ئەویش لەوەڵامدا پێیان دەڵێت «أفندی ئاسار یوقدر» لەراستیدا ئەم کارەساتە پەیوەندی دارەو بنج بەستە بەبوونی حاڵەتی ـ نامۆیی ـ نالی خۆیەوە. خۆ ئەگەر نامۆییو دووره ولاتیو بێکەسی ی نەبووبێ لە جێگەیەکدا کە زۆر دوور بوە لە جێو هەواری دڵ خۆشکەری خۆی ئەوا ئەو بەرهەمە ڕەنگە چەند ئەوەندەیەکی دیوانەکەی ئێستای بوایە کە لەبەر دەستماندایە. هەروەها ئەم نامۆییەی نالی لە زۆر لەو ڕووداوو پەیوەندیانەی کە هەی بوە خستوینیەتیە گومان و کورت بینیەوە زانیاریش دەربارەیان وەك ڕوناکی چرایەکی کز وەهایە. بۆ نمونە پەیوەندی نالیو میرنشینی بابان و ئەحمەد پاشای بابان لە سێ شیعری نالی زیاتر هیچ زانیاریەکمان وەهیچ ڕوداوێکمان ئاگالێ نیە. ئەو سێ قەسیدەیەش یەکێکیان ئاشکراو دیارە بۆ کۆچی دوایی سلێمان پاشای بابان ی نووسیوە لە کارەساتی کۆچی دوایی ئەو داو هاتنە سەرتەختی ئەحمەد پاشا. وەك لە کتێبەکەیدا ساخ کراوەتەوە ئەم ڕوداوە ساڵی 1254ی کۆچی بەرانبەر ساڵی (1838 ـ 1839)ی زاینی بووە. ئنجائەمە هێشتا ڕوون نیيە کە نالی کاتێ ئەم شیعرەی وتوە لە کوردستاندا بوە یاخود لەشام یا ئەستەموڵ. سەرەتای قەسیدە کە ئەمەیە:ـ

«تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو
کەوکەبەی میهری موبارەك تەلعەتی پەیدا نەبوو
تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت
دڵ چەمەن ئارا نەبوو هەم لێوی قونجەوانە بوو»

قەسیدەی دووم گومانی تێدا نیە کە بۆ دەسەڵات و حوکمڕانیو شکۆی سوپای بابان وتونی. بەڵام لەمەیشدا بەڵگەمان بەدەستەوە نیە کە ئایا لە ولاتی نامۆیی وتویەتی یاخود بەپێچەوانەوە؟! سەرەتای قەسیدەکە وەها دەست پێدەکات

«ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسەیی شاهن
ئاشو بیدڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن»

هەروەها لە نمونەی قەسیدەی سێیەمیشدا تەم و لێڵایی لەسەر ئەوەیە کە ئایا ئەو قەسیدەیە بۆ کام لە خێزانی حوکمڕانی بابان وتراوە بەڵام لەدوا بەیتیدا کە لێی وردەبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نالی لە ولاتی نامۆیی ئەم شیعرەی نووسیوە. دەڵێت

«مەعلومە لەوێ ڕازو خوتوری دڵی نالی
إدْخَلْ بِقَلْبِي وبأسراره نومی»

دیسان لەمەشدا ئەوە ئاشکرا نیە کە ئایا قەسیدەکەی لە کام ولاتی نامۆیی وتوە، بەڵام لەوەدا گومان نیە کە بۆ کەسێکە لەبنەماڵەی بابان

«ئەی قەلەمەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بوروجی
وەی قوللەیی دووری کەدەڵێی قەمەتی عوجی
وەك قالبی زەمین قابیلی ئیکمال و تەرەقی
وەك بورجی سەما لایقی ئیقبال و عوروجی»

لەچەند لایەکەوە ئەوە ئاشکرا بوە کە نالی و ئەحمەد پاشای بابان لە ئەستەموڵ هاوێی یەکتربوون و ساڵانێکی ژیانیان پێکەوە بەسەر بردوە.

نالی وەك تۆراو دڵ شکاو نامۆیەکی بێئاکامی دوارۆژی گەڕانەوە ئەحمەدپاشای بابانیش وەك پاشایەکی تەخت و تا چ لە دەست چوو باشترین سەرچاوەکە باسی جۆرو کاتی پەیوەندیەکە دەکات دیوانی نالی ـ یە لە لاپەڕە (30)دا نووسراوە «ئەحمەد پاشای بابان لە ـ 1853 ـ دا پاریس باسی نالی بۆ ـ خۆدزکۆ ـ ی شابەندەری ڕوسیا کردوە وا ئەگەیەنێ نالی لەو سەردەمەدا لە شام ژیاوە چونکە شیعرەکەشی کەپاش تێکچونی حوکمی بابانیەکان بۆ سالمی ناردوە بۆ سولەیمانی لە شامەوە ناردویە. لەلایەکی کەشەوە هەموو ئەوانەی مێژ وی ژیانی نالی‌یان خستۆتە سەر کاغەز باسی ئەوەیان کردوە کە وا نالی پاشان چۆتە ئەستەموڵ و لەوێ لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان ماوەیەکی دوورو درێژیان پێکەوە بەسەر بردوە»[4] لەدیوانی نالی‌دا ئەم پەیوەندیە بەم جۆرە باس کراوە. وە ئەم ڕوداوانە هەتا ئێستا سەدو سی ساڵی بەسەردا ڕابوردوە کە ئەم مێژ وە بۆ ئەدیب و زانایانی ئەوروپا ئەوەندە زۆر نی‌یەو هەر ئێستا وێنەو یاداشت و نووسین و دەست خەتی ڕاستەقینەی شکسپیرو تولستوی‌و دانتی‌و دوستوفسکی‌و زۆری تریش کە دە ئەوەندەی ئەو سەدو بیست ساڵەی بەسەردا ڕابوردوە کەچی وەك ئەوەی دوێنێ بووبێ لەبەردەستتایەو هەر یەك لە جێگای تایبەتی خۆی دانراوەو تەنانەت هەندێکیان وەك بودلیرو هوگۆو چیکۆف خانۆکانیان کراونەتە مۆزەخانەو پێشانگاو لە هەموو لایەکەوە دێنە دیدەنی‌و تەماشای بەڵام بەهۆی دواکەوتوویی ئەو سەردەمە تاریکانەو تەبیعەتی شەڕ خوازو بەر بەری مرۆڤ و دڕندایەتیەکەوە ئێمەی کورد بەدبەختانە لەو کەلەپورو سامانە بەنرخ و بەهادارانەی ڕۆژانێکی تەنانەت زۆر نزیکیشیان بێبەش بوون و نالی‌و ون بوونی نوسراوو ساڵی مردن و لە دایك بوون و ناوی ژن و جێگاو ڕێگای هەموو وا بەزوویی کوێربونەتەوەو جێگەیان نەماوە.

- بەشی سێیەم -

پەیوەندیی بابەتی لە نێوان نامۆبوون و کەسێتی نالی‌دا بووە بە یەکێك لەو لایەنانەی کە زۆرتر لە هەموو لایەنەکانی شیعری نالی هەڵدەگرێت لە سەری بنووسرێت. ئێمە لە وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەدا دەتوانین بەمەرامی باسەکەمان بگەین کاتێ پرسیار دەکەین و دەڵێین:

1 ـ ئایا کەسێتی نالی چ گۆڕانکاریەکی تێدا خولقاوە کاتێك لە ولاتی خۆیدا بووەو کاتێکیش چۆتە شام و ئەستەموڵ چ لەڕووی بابەتی شیعرەکانیەوە چ لە ئوسلوبی شیعری ئەودا؟!

2 ـ ئایا فکری نالی وەك شاعیرێك پێش هەموو شتێك ڕێگەی بەو بیرو هەستانە داوە کە لەو سەردەمەی خۆیدا زۆر لە مرۆڤە میسالی‌و خەیاڵ پەرستەکان ڕێگەیان بەخۆیان داوە؟! ئایا دژایەتی نالی بۆ شێخ و دەروێش و وشکە سۆفیەکان نمونە نین بۆ بیری ڕاپەڕیوو حاڵەتی شۆڕش لە فیکری شیعری ئەودا؟!. وە ئایا ئەمانە چ پەیوەندیەکیان بەنامۆیی نالیەوە هەبووە؟!.

3 ـ ئایا ئەو مەبەست و خواستانەی کە نالی داوای کردوەو هەندێکی کەمی لێ‌دەربڕیوەو گەلێکی زۆریشی وەك ئاواتی دوارۆژی خۆی هەر لە توێی دەروون و کەللەیدا ماوەتەوەو بردو نیە ژێر گڵ مەگەر لای ئەوانە درکاندبێتی کە زۆر نزیك بوون لێیەوە وەك ئەحمەد پاشای بابان و هاوڕێ کوردو تورکەکانی کە لەشام و ئەستەموڵ هەمیشە هاوڕێ وهاوڕازی بوون و ئێمە نازانین کە ئەمانە کێن و چ کارە بوون؟!

4 ـ ئایا لە بابەتی نامۆیی نالی‌دا پەشێواوی‌و خۆ بیرچونەوە خودپەرستی‌و لەدەست چوونی واقیع هیچ دەوری

بنیوە لە شیعرەکانیداو بەرچاو دەکەون؟!

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین:-

پیرەمێرد - ی ئەدیب و زانا دەڵێت «لە نەزەر نالی‌دا شیعر ئەسڵ و غایەیە قەت بەوەسیلەی بەکار نەهێناوە. حەیات، عیشق، حەتتاحەسیاتی باوکی‌ی لەلای ئەو عیبارەتن لە شیعر»[5] ئێمە تەواو لەگەڵ ئەم رایەی پیرەمێرد داین چونکە لای نالی شیعـر غایـەیـە واتـە ئامـانـج و ئەنجـامێـك دەبـەخـشێت و خۆشی هەر لە خۆیـدا ئامـانـج بووە بۆ ئەنجامێك بووە. ئایا نالی شاعیرێك بووە کە مەبەستی لە شیعر تەنیا شیعربووەو ناوێکی شاعیرانە؟!

یاخـود غایـەیـەك ،هـەستێکی قوڵ و بێ بنی ناخی قەڵـەمی پێ گرتـوە بەدەستەوەو ئیداعی گەورەی شاعیرانەی پێ ئەنجام داوە؟

لەوەڵا مدا دەڵێین:- شیعر لای نالی لەهەردوو قوناغی بوونـی لە کوردسـتـان خۆی‌و نامـۆبـوونـی لە وڵاتـان وەڵام دانـەوەی ئەو پرسیـارانـەبـوون کە خولیـای مێشکی جەنجـاڵ و کاس بوون وهـەمیشـە لەخۆی پرسیوەو دوبارەی کردوتـەوە زۆر باش لەوە دڵـنیـا بووە کە داهـێـنـانی ئەو وەستایەتی شاعیرانەو جوانی وشەو قووڵی مانا لەو رۆژگارەدا تەنها لای خۆی بووەو هەر چەند چاوی گێراوە لە نەوعی شیعـری خۆی ،لـەپـەیـوەنـدی توندی ماناو شێوەو ناوەرۆك ،گـرێدانی زانستی بەلاغـەت بەزانستی ئەستێـرە ناسی‌و فیـزیـاو جوگـرافیـاو مێـژوو ریـاضیـات . . . هتد ئەم جۆرە غایەیە لە شیعردا لای نالی لە سەرەتاوە لای دروست بووەو گەشەی کردووەو چەندیش چۆتە ساڵەوە ئەوەندە زیاتر هێزی شیعرو گوری داهێنانی باشترو خێراتر بووە. ئێمە دەتوانین گەڵێك قەسیدەی بۆ ئەم مەبەستە بکەینە نمونەو ڕاستی رایەکەمان.

ئوسلوبی شیعری نالی لە حاڵەتی نامۆیی‌و هەست کردن بەنامۆیی بابەتی ئەو چ لەبێ دەرەکانی خۆی وەك کوردێکی دورە وڵات و بێ‌پشت و پەنـا، چ وەك دڵـدارێکی بەمـەرام نەگـەیشـتـوو هەردەم لە پەیـوەنـدی تازەبوونەوەو بەهێزبوونی خۆیـدا لە تەفـاعـولێکی دینـامیکیـدا بەرەوپێش ڕۆیشتـوە.

شیعری ئەو ئەوە بوە کە بتوانێت مانای قوڵ وەستایەتی وشەو دارشتن و بابـەتی فراوان و فەلسـەفی بەئـوسلوبێکی نەرم و بێ‌گـرێ‌و گۆڵ و شەفـاف دەربـبـرێـت ،لـەمـەشدا ئەوپەری سەرکـەوتنی بەدەست هێنـاوە وڵاتی نامـۆیی‌و بێ‌دەرەتانی‌ی ئەو مرۆڤـە گەورەیـە هەمیشـە بووە بە بیـرکـردن و یادکردن و خەم خواردن بۆ چارەنـووس و هیـوای (وەسڵی مەحبـوبـە)و شادبوونی رۆحی

**بەحەسرەت عومری یەکبارە فەوتا**
**مەگەر عومرێ دوبارەم پێ‌عەتاکەی**
**گوتت نالی ئەتۆ بمرە ئەمن دێم**
**خوداکەی بێ خوداکەی بێ‌خودا کەی؟!**

یاخود دەفەرموێ

**«دوور لەتۆ هێندە بێ ئارام و بێ‌حاڵ کەوتوە**
**• ئەی مەسیحایی عەسر لەو لێوانە دەرمانی ئەوێ**
**ڕووم ئەوا زەرد بوو وەك پایز لەهیجران - نالیا -**
**عەشق ئێستاکەش لە من سەیلی بەهارانی دەوێ»**

ئنجـا ئەوەی لە شیعـری - نالی - دادیـارە ئەوەیە کە ئوسلوبی شیعری لە دوای ئاوهێنانی - حەبیبەی تێدا کەم دەبێتـەوەو یاخـود هەر نامێنێ‌و دەبێتـە یادکـردنی نیشتمـان ئوسلوبی بەهێز ترو توندترو قوڵ تر دەبێت.

**«دڵی نالی کە ئەنیسی قەرەداغە ئێستەش**
**داخی سەرچاوەو دێوانەیی دارو دەوەنە»**

کە واتە ئەو گۆڕان کاریە بابەتی‌و خود ناسیەی نالی کە لە شام و ئەستەمول بەسەر شیعرو ویژدان و هەستیاهاتوە وە فراوانی ئاسۆی بیرو هێزی شیعرو گورەی داهێنان وخەمی گەرانەوەی بۆ نیشتمان و بینینەوەی حەبیبەی ماڵیاواو دەوەن و شاخ و داری قەرەداخ بەڵام لەگارکردن و داهێنان و پادشای نەختی بێ‌هامتای شاعیریدا دنیا جوانتر خۆی نواندوە. لە وەڵامـی پرسـیـاری دوەمیشـدا دەڵێین کۆچ کردنی نالی‌و سەفـەری بێ‌گـەرانـەوەی بۆشـام و ئەستەمۆل لەو ڕاپەڕین و یاخی‌بـوونـەوە بوو کە لە ناخیـدا بەرپـابـووە. دەبوا ئەویش

بەئەنجامی بگەیاندایە. ئێمە دەڵێین هەڵوێستی نالی هەڵوێستی شاعیرێکی یاخیو ڕاپەڕیوبوە. ئەگەر چی لە ئوسوڵی شیعرو داب و خوی ڕێلچکەی شیعری علاسی لای نەداوەو هێڵی تازەگەری ناوی لە ناوا نەبوە بەڵام نالی توانی شۆڕشێك لە ناوەڕۆکدا بکات، شۆڕشێك و یاخی بوونێکی زانستیانەی شیعریی لەمانادا بەرپاکرد. لەبەرئەوەیە نالی مامۆستای یەکەم و قۆناغی دەست پێکردنی هەنگاوی یەکەم و ڕەسەنایەتی شیعری کوردی دادەنرێت. خۆشەویستی وشەی کوردیو زمانی کوردی لە ناخیدا چەسپیوەو مایەی شانازی ئەو بوون. لەلایەنی دوەمیشەوە وەستاندنەوەی بەرانبەر بیرەپرو پوچەکانی ئەو سەردەمە زیاتر گیانی یاخی بوون و شۆڕشیان تێدا بەرپاکردو کردیانە خاوەن هەڵوێست وە لە دوای دەسەڵاتی ـ ض بابان ـ یش هەر ئەو بەرەیەبوون کەدەستیان نایە ناودەستییەك بۆ دروست کردنی هێزێك کە نالی بێزارو ناچار بکەن ڕوو لە وڵاتی نامۆیی بنێو باوەش بەئازاری دووریو بێدەرەتانیدا بکات.

لێرەدا دەپرسین ،ئایا لە بابەتی نامۆیی نالیدا بیر شێواویو خۆ بیر چونەوەو خود پەرستیو لە دەست چوونی واقیع هیچ دەوری بینیوە لە شیعریداو بەر چاو دەکەون؟! دەڵێین:ـ

نەخێر بەپێی بارودۆخی ئەو ڕۆژگارەو پێوانەی بەقوتابخانەیەکی ئەدەبی دەڵێین:ـ نالی شاعیرێك بوە لە قوتابخانەی ڕیالیزم چ لە حاڵەتی واقیعی ژیانی خۆیداو تێگەیشتن لەباری ئەو واقیعە تاڵەو لێك دانەوەیەکی مەوزوعیانە بۆی وە چ لە وێنەکێشانی ڕۆژانی ڕابووردوو وەپێش بینی داهاتوو نالی دەڵێت:ـ

**«تەحریری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێتە حیسابی**
**دەروێش و گەدا شاهو دەبێ شاگەدا بێ»**

یاخود دەڵێت:ـ

**«چونکە نالی لەسەر ئەم ئەرزە غەریبی وەتەنی**
**هەستەباری مەدەنی بەمەدەنی بە مەدەنی»**

لەم ڕوەوە واتەیەك لە کتێبی ـ الشعر في اطار العصر الثوري ـ دا هاتوە دەڵێت «ڕۆشنبیریی شاعیر مەرجی بنەڕەتیە بۆ تێگەیشتنی لە ژیان .سەرکەوتنی شاعیر لەوەوە نایەت کە باسی ئەو واقیعە بکات کە تیایدا دەژی بەڵکو چۆنیەتی کارەساتەکانی ژیان لێك بداتەوە شاعیر ناتوانێ دوو ویژدانی هەبێ ویژدانێ لەگەڵ خۆیا کاری پێبکات و ویژدانێکیش لە گەڵ خەڵکا. ئەدیبی ڕاستەقینە بەیەك ویژدان ڕووبەڕووی خۆیو کۆمەڵ دەبێتەوە چونکە هەست ئەکات کە گیروگرفتە تایبەتیەکانی خۆی لە گیروگرفتەکانی کۆمەڵ جیا نابێتەوە وهەر ئەو گیروگرفتانە شن کە ئەو هەوێنی شیعرەکانی لێوەدروست دەکات»(6) نالی دەگاتە ئەوەی کە بەراورد کاری بکات واقیعی خۆیو بابەتەکانی سەردەم ڕوون بکاتەوە و ئەگەرچی بوونی خۆی بەربەیدی مەجنون ـ بشوبهێنێ بەڵام ئەو (حومقەی کە عەلاوەی کەری) یەی بەخشیوە بەکێو دەیەوێت بڵێ چی؟!

**«بەیدی مەجنونە وجودم لە هەموو بەر بەرییە**
**نە کەسێ مونتەفیعیەك بەری یاسێبەرییە**
**چیت لە کاکۆڵێ سەرو موی میانی داوە**
**هەموو هەر هەم و پەرێشانیو دەردی سەرییە**
**بەڕ یاباری تەکالیفی ڕوسومی بۆ خەڵق**
**چ دەکێشێ ؟ئەمە حومقێکە عەلاوەی کەرییە**
**لۆمەیی نالی دێوانە مەکەن ئەی عوقەلا**
**ئەمە مودێکە زەدەی لە تمەیی دەستیپەرییە**

بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارەی بەرەو ڕوی خۆمان کردەوە کە دەڵێین ئەو مەبەستانە چیبوون کە نالی زۆری لا مەبەست بوەو کەمێکی کەمی لێ دەربریوە؟! ئەگەر بێت و ستایشی ئاینیو چەند شیعرێکی موناسەباتی لێدەر بکەین چەند قەسیدەیەکمان بەرچاو دەکەوێت کە ئاشکرایی ئەو مەبەستانە تێکەڵ بەواقیع و کارەساتی دووریو نامۆیی نالی دەربرێت وەك
دەڵێت

**«زاهیرو باتین لە سەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز**
**ئاشنای سیری قەڵەم بێ غەیری نالی کەس نەما»**

ياخود

«فاتیحە ـ تەخسیرە شاری دڵ بەتابووری ئەلەم
مودەتێکی زۆر پاتەختە لە بۆ خاقانی خەم
حوکمی قانونی سەفا ڕۆیی لە ڕەومی ڕومەدا
تا هویدا بوو لە ڕووما گەدی ئاشوبی عەجەم
تۆزی ئاینەی سکەندەر وابەدەم باوە وەلێ
گەردی دامانی غەریبانە بلوری جامی جەم»

لەراستیدا دوو ڕێگە هەیە بۆ تێگەیشتن لەو حاڵەتە تایبەتیانەی دەبنە سەراپای شاعیرو شاعیریش دەبێتە ئەوان ـ لێرەدا نمونەی بیروڕاوواتەی دووزانا بەبەراورد لەگەڵ جیهانی نالی‌دا دەنووسین، ئیفلاتون دەڵێت «شاعیر ناتوانێت لێك دانەوەیەکی ئەقڵی بۆ هەر شتێك بکات وەك چۆن کارسازێك یاخود دکتۆرێك یاخود دەریاوانێك ئەنجامی دەدات بەڵکە شاعیر هۆیەکە بۆ گواستنەوەی ئەو سروشەی کە بۆی دێت»[7] ڕای دوومیش کە پێچەوانەی ئەمەیە وتەی (سانت بیف)ی فەرەنسی نووسەرو ڕەخنەگرە کە دەڵێت «یەکەم هۆی کاری گەر لە هەر شیعرێکدا کە سێتی شاعیر خۆیەتی یاخود بە شیوەیەکی وردتر بڵێین ژیانی تایبەتی ئەو ژیانەی کە مەزاج و بیروباوەڕێکی تایبەتی بۆ دەخولقێنێ»[8] وە ئەم ڕەخنەگرە داوای کرد کە لێکۆڵینەوە لەشیعر لێکۆڵینەوەیەکی سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتی بێت، بەرانبەر ئەم دوورایە دەڵێین:ـ لەزۆر لە دەقەکانی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی لە شیعردا هەیە کە خەیاڵ و دوور کەوتنەوە لە واقیع و بڕوا بوون بە سروشی شاعیریی بەهێزێکی نەزانراو بەهێزو نادیاریی دەزانێت. وەهەر لە سەردەمەکانی زۆر کۆنەوە یەکەم کەس کە بەیت و باوی ئەو جۆرە بیرکردنەوە ئایدیالیانەی هەڵ وەشاندەوەو ڕووی بەرەو جێگایەکی‌تر وەرچەرخاند ـ ئەر ستۆری فەیلەسوف و زانابوو. کە دەتوانین مەرجی مەرجی یەکەم بەردی بناغەی بیری ماتریالی لەوەوە دەست نیشان بکەین ئایا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کەنالی بەشاعیرێکی ماتریالی دابنێین؟! وە هیچ مافێکی بیری ئایدیالی پێ نەبەخشین؟! نەخێر، بەڵکو شاعیر خۆی لەخۆیدا پڕ بەپڕی بیری ئاینی ئەو سەردەمەو وەك مەلایەکی هوشیار هەر هیچی لەو شتانە نەزانیووە نەبیستوە کە ئێمە ئێستا ناوی دنیای ـ ماتریالی ـ لێ دەنێین بەڵکو نالی بەخۆبەستنەوەی بەبیری کۆمەڵایەتی ڕاست و بەگژاچوونی خەرافیات و بەدووداچوون و هەوڵ دانی بۆ تێگەیشتنی زیاتر لەزانیاری ئەستێرە ناسی وفیزیا دەرکی بەزۆر لەو لایەنانە کردوە بەڵام مەودای ڕۆژگارو کزی دەوری فەلسەفی لەڕۆژهەڵاتی ئەو کاتە دا نەزعەی خەلاخەتی ئاینی‌ی عوسمانی زۆری لەم بیرانە لە پشت پەردەوە داناوەو تۆزی ڕۆژگاری دێرینی لەسەر نیشتوە. وە نالی شاعیریش هەر بە ئاوات و حەسرەتەوە وەك زۆر ئاواتی دووررو بەدی نەهاتوی لە ڕۆژگاری ئەو سەردەمەدا دەنگی بەرزو دڵ نەوازو واقیعیانەی تێکەڵ بەگەردەلول بووەو ڕاپێچی کردووەو لەپاش مەرگیش ڕۆحی نەحەسایەوەو ئەو هەموو بەرهەمە پیرۆزانەی بەدەستی کەسێکی نەزان بوونە پێخۆری ئاگر.

سەرچاوەکان:ـ


1 ـ مژدەی دۆزینەوەی ساڵی تیامردنی نالی ـ محمد مصطفی حەمەبۆر هاوکاری 1983/7/21

2 ـ ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (293) ئەیلولی 1931 خدمەتێکی بێ‌هەمتا.

3 ـ نالی لە دەفتەری نەمریدا معروف خەزنەدار ل

4 ـ دیوانی نالی مەلا عبدالکریم مدرس 1976

5 ـ سەرچاوەی ژمارە دوو

6 ـ الشعر في اطار العصر الثوری د. عزالدین اسماعیل

7 ـ الشعر والألهام ـ مجیة محمود مطلب ـ أقلام العدد (8) 1975

8 ـ هەمان سەرچاوە دەربارەی سانت بیف.

9 ـ تێبینی:ـ ئەو شیعرانەی لەم باسەدا بەنمونە هێنراونەتەوە لە دیوانی نالی مەلا عبدالکریم وفاتح عبدالکریم وەرگیراوە.

# ئەدەبێ بەرگریێ ل "15" وەلاتێت ئەورووپی

- بەرهەڤکرنا - وەصفی حسن ردێنی

ئەدەبێ بەرگریێ (المقاومة) هاتە خویاکرن و پیشکەفتن دگەل بزاڤا ئازادیخوازیا وەلاتێت ژێر دەست و ب شێوەکێ بەرفرەتر هاتە ئاشکراکرن لناڤ وەلاتێت (محوری) ل شەرێ جیهانیێ یێ دووێ (1939 - 1945).

ئەدەبێ بەرگریێ ل ئەورووپا ئەو بەرهەمە یێ کو هاتیە نڤیسین دگەل خەباتا نیشتمانیێ و نەتەوەیی یێ میللەتێت ئەورووپی دژی داگیرکەرێت ئەلمانی - هیتلەری ل سالێت شەرێ جیهانی یێ دووێ.

تورەڤانێت وەلاتێت ئەورووپی بشکداریکر د خەباتا بەرگریێ‌دا ب هەمی رەخاڤەو ب هەمی شیانێت خوڤەو ئەو تورەڤانێت دەربەدەرو دویر ئێخستی (معبد) ژی، پشکداری د ڤێ چەندێ دا کر.

ئەلمانێت داگیرکەر گەلەك زیان دگەهاندە رەوشەبیریا وان میللەتێت وان داگیر دکرو گەلەك پێکول دکر بو نەهێلان و پویچکرنا رەوشەنبیریا نەتەوەیی یا ڤان وەلاتا، ئەڤجا ژ بەر زولم و ستەمکاریا ئەلمانا تورەڤانێت ڤان وەلاتا نەچار بوون دەست پکارێ نهینی کرو گەلەك ژ تورەڤانا چونە دناڤ رێزێت بەرگریا میللیدا و هندەك تورەڤانێت دی خو فروت و تەرخان کر وەك ئامیرەك بو خزمەتا داگیرکەرا وەك (دریولا، روشیل ،سیلین ل فەرەنساو غامسون ل نەرویج).

سەخلەتا سەرەکی یا تورێ بەرگریێ ئەوە مروڤ ئیکاتیێ و تێکەلیەکا موکم دناڤبەرا دوزێت نەتەوەیی و مەسەلێت کومەلایەتی تێدا دبینیت و ڤێ رەنگێ تورەی خەباتا میللەتێت و ژێر دەست و بەرگرو بەرهەلست دژی داگیرکەرێت ئەلمان، نیشا خویندەڤاناداو هندەك جارا ژی بەحسێ بابەتێت کومەلایەتی دکرن.

ڤان تورەڤانا بەرگریا دوژمن یا کری ب خامەی و تڤەنگێ لەورا دڤێت ئەم بێژینە ڤانا خەباتکەرو لەشکەرو یا هەژی گوتنێ ئەوە کو هوزانێ پتر دەورێ خو دیت دناڤ ئەدەبێ بەرگریێ ب شێوی گشتی، لناڤ ئازارو کوڤانێت میللەتێت ژێردەست شانوێت تەراجیدی پەیدابون و هندەك نڤیسەرێد دیرو کرە رومانێ‌دا بشین پتر وێنی زولمێ و وێرانکرنێ بو جەماوەری روونکەن، هەروەسا نامێت وان خەباتکەرا ئەوێت هاتینە سێدارەکرن تێنە هەژماتن ژ هەرە بەلگەنامێت وی چەرخی.

رەوشت و تیتالێت نەتەوەیی و کومەلایەتی بنواشێت رەسەن بون د ناڤ ئەدەبێ بەرگریێ‌داو هوسانی ئەدەبی بەرگریی بو هێزەکا تەواوکەر بو هێزێت چەکدار دژی داگیرکەرێت هیتلەری، ئەڤجا بو زێدە ناسینا ڤی ئەدەبی و ناسینا هەلگرێت ئالایێ ئەدەبێ بەرگر ل هەر (15) پازدە ولاتێت ئەورووپی دێ کەت کەتە بەحسێ هەر وەلاتەکی کەین.

- ئەلبانیا -

سترانا شورەشگێر جهەکێ بەرفرەهـ ڤەگرت دناڤ تورێ ئەلبانیدا یێ بەرگرو گەلەك تورەڤان بڤی تشتی بناڤ و دەنگ کەفتن وەك [میتو ئەوێ ل سالا 1944 شەهید بوی و هەروەسا یاکوفا، غیاتا دودا] ئەڤ هوزان و سترانەد تەرخان کریبون بو سەرکەفتنێ و خەباتێ و ئازادیێ و یاری پێ کرنێ ب هێزا دوژمنی و گەلەك بەرهەم هاتنە نڤیسین بو بیرهاتنا

حەجیێ دەستی گیرابێت. ئینجاتین و تەوژم بدە بە هەنگاوەکانت، باڵیان لیێ پەیداکە خۆت بگەیێنە تووکەو، نە ڕێی لقە ووشکەکەیەوە بگە بە سەربانەکە، وا نەکەیت تۆباڵی خۆت دەکەوێتە ئەستۆی خۆت، گەر بەر پلارو خرکە بەردی خەجیێی ئەمین بابی کەوتی ولەسەر ئەو لقە ووشکەوە بە پشت دا بەربوویتەوە.

ئێستا خۆ ئەو سەربانانەت لەبەر چاوە ئەو شەوە جمەی دەهات.

تا دەشهات پێوەی دەنیشتەوە دەنگی مەلاو، هارەی دەفەکانیان گەرەکی هەڵدەگرت گۆڵاو دەپرژێنراو، مێوژ و کاکڵە گوێزو شیرینی لەکۆش دەکرا.

ئەم شەوە تۆ خۆت دوور گرتبوو. بە گوێسوانەکەوە نیشتبوویتەوەو لاقە شۆڕ بودەکانت دەهێنان وئەبرد دوورو نزیک دەترووانی وەك هەموویەکێکی دی، هەڵپەی کۆش پرکردنت نەبوو.

سەرنجە تیژەکانت خەڵکەکەی ئەمدیو ئەودیو ئەبری ووردتر دەترووانی چاوت دەگێرا، تا لەسەر کچۆڵە باریکەکەی، ئەو سەری حەشاماتەکە گیرسانتەوە.

تۆ ئەو کاتە تەمەنت هەر چواردە ساڵێك دەبوو. وەك ئەو قژکاڵ و ئێسك سووك بوویت. شەرمت لە هەموو کەس دەکرد. سەرت دادەخست و هەڵت نەدەبری. بەبیرتا دێ زۆر جار تا میوانە کانتان دەرۆیشتن لە پشتەیوانەکەتان دا بەند دەکرد، کەچی ئەو شەوە شەرم و شکۆتا دەهات لای تۆ کاڵتر دەبووەوە. ئەو شەوە دڵت بۆ یەکەمین جار بۆ خۆشەویستی لێیدەدا ئەو شەوە بەدووی کیژۆڵەیەکی ئێسك سووکی وەك خۆت دەکەوتی.

ئەو شەوە کە چاوت لەسەر ئەو رادەگرت و دەگیرساندەوە هەر کەسێك ڕێگەی بە سەرنجەکانت بگرتایە، قین و ڕقت لێی دەبووەوە، بە دەستت بووایە مێشکیت بهاریایە.

ئەو شەوە ئەو کیژۆڵەیە لای تۆ، دەبووە خولیاو، تا دەهات دەیهەژانی دەیهەژانی و کارو کردەوەی ئەوتۆی پێ دەکردی، کە هەرگیز لەوەوبەر لەتۆ نەوەشابێتەوە.

کەی تۆ لەوەوبەر ئەووت بەخۆتەوە دیوە، بە ئیشارەتێك مندالە کاکۆڵ زەردە، جگەرە گیرەکە بانگ کەیت و، جگەرەیەکی زەلی لی وەرگریت. جگەرەی زەل بۆ لێوت ڕاگریت. بە دەنکێ شقارتە دایگیرسێنیت. چاو لە چاوەکانی ئەو ببریت ونەیتروکێنی، نەیتروکێنی و پڕ بە سی یەکانت دووکەڵی ئەو جگەرەیە هەڵمژیت،

تۆ چاوت بڕیوەتە ئەوو، لێی ناترووکێنی ئەویش جار جار چاوێك لە ئاستی تۆدا هەڵدەبرێت وەدای دەخات، تێکەڵ بە زەردەخەنەیەکی ناسکی دەکات و بۆتی دەنێری بەمە ئەوەندەی تر گێژت دەدات و، دەتئالۆزێنێ. لەوەش زیاتر تروسکەی هیوایەکی گەش بە ناخت دەبەخشێ.

مژی جگەرەی زەل ، کوکەو خیزەیەکی خنکێنەری بۆ هێنایت هەناسەی لەسنگت دا بۆ ماوەیەك تاسان وراگرت. چاوی پێ دەرپەڕاندیو، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی پێ ڕشتیت. بینایی لێ ڕەش کردیت و، ڕۆشنایی لێ کردیتە لێڵی و تارمایی هەستت بەخۆت دەکرد، سەرت گێژ دەخوات وگیانت دەلەرزێت و تا دێت شل دەبێت.

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی کە دایکت هاتە ژوور سەرت پێی ووتی:

سەرت شین کەیت ئەو مەولووە خۆشەت بۆلێ کردین بە زەهر تۆ دەزانی ئیمشەو چیت بە ئێمە کرد باوکت بیزانیایە ملی هەڵدەکێشایت بەمن و پوورت بە چووار دەستە هەڵمان گرتیت تا ڕۆژ بووەتەوە. من بەژ وور سەرتەوە بووم.

خووا خووات بوو دایکت لەوە زیاتر لەباری درێژی نەیداتە دەمی.

لەوڕۆژە بەدوواوە جار جارێك نەبێت تۆ ئەوناییبینیتەوە لە هەموو جارێك لەو جارانەدا ئەو شەووت بیر دەکەوێتەوە و، لەبری ئەوەی پەیکەری بەژن و باڵای بۆ نیگاو سەرنجە تینووەکانت ڕاگری سەر دادەخەیت.

ئەویش بەزەردە خەنەیەکی ناسك ناسکت دەسپێرێت و وورد وورد شەقامەکە بۆ هەنگاوەکانی رادەخات.

# "ڤێجە یاخود مجێور"

نووسینی W - Somerset Raugham سومرست موم

وەرگێڕانی لە ئینگلیزی‌یەوە :پەیمان احمد

میستەر فۆمص خاوەنی (دە) دووکان بوو لەچەند شوێنێکی جیاجیادا لە شاری لەندەن، کە هەموو دووکانەکانی تەنهایەك جۆر شتیان دەفرۆشت ئەویش: سیگار، جگەرە، توتن، هەروەها پایپ بوو. دووکانەکان هەمیشە پربوون لەکریارو (میستەر فۆمەن) یش خۆی پیاوێکی دەوڵەمەندبوو.

بەڵام (ئەلبێرت فۆمەن) لە وەپێش دەوڵەمەند نەبوو، دایكوباوكی زۆر هەژاربوون تەنانەت پارەیان نەبوو (ئەلبێرت) بنێرنە قوتابخانە.

بۆیە لە تەمەنی دەساڵی‌یەوە دەستی دایەکارکردن و بو بەخزمەتکاری ماڵە دەوڵەمەندێك، هەرچەندە ئەلبێرت گەنجیش بوو، بەڵام هەموو جۆرە کاروکاسپی‌یەکی دەکرد. لەبەرئەوەی زۆر ئیشکەربوو تا دەهات کاری گرنگترو



زۆرتری پێ‌دەدرا، شوێنانی پاک دەکردەوەو ڕێکی دەخستن. خۆشی جلی ڕێک و پێکی لە بەردەکردو لەلایەن خەڵکەوە ڕێزی لێ دەگیرا. لە تەمەنی(بیست) ساڵی‌دا بوو بەسەرۆکی خزمەتکارەکانی ماڵە دەوڵەمەندێک.

ئەلبێرت لە تەمەنی (بیست و دوو) ساڵی‌دا ژنی هێنا ،خێزانەکەشی دووبارە کارەکەری ماڵان بوو بە جووتە خزمەتیان لەیەک ماڵدائەکرد ، ئەمیش ئیشکەری هەمان ماڵ بوو کە ئەلبێرت تیایدا کاری دەکرد.

لەپاشان ئەلبێرت کارێکی نوێی دەسکەوت، بوو بە (خزمەت چی) کڵێسای (سانت پیتەرز)کە کەوتبووە (نیڤڵ سکوێر) ەوە لە ناوەندی دەوڵەمەندترین شوێنی لەندەن دا.

پیاوە دەوڵەمەندە ناودارەکانی کەلە خانووەکانی نزیک کڵێساکەوە دەژیان کاتێ ساوابوۆن دەبرانە (سانت پیتەرز) ەوەو ناویان لێ دەنان، وەلە (سانت پیتەرز) ژنیان مارە دەبڕی‌و کاتێکیش دەمردن هەرلەنزیک ئەوێوە دەنێژران.

(ئەلبێرت ی خزمەتچی) لەهەموو ئەم کاتەگرنگانەدا ئامادەدەبوو بەخۆی‌و (رۆبێکی) درێژ ی ڕەشەوە لە نزیک دەرگاکەوە دەوەستاو هەمیشە کڵێساکەی بەپاکی‌و ڕێک وپێکی ڕادەگرت.

خەڵکەکە لەکڵێسای (سانت پیترز) لە (میستەر فۆمەن) ڕازی بوون، بەم شێوەیە شازدە ساڵ لەوێ کاری کرد ،لەوماوەیەدا هیچ نارەحەتی‌یەک نەهاتە ڕێ‌ی، قەشەپیرەکە (میستەر فۆمەن) ی خۆش دەویست و متمانەی تەواوی دابوویە. ئەیزانی کە (ئەلبێرت) توانای خوێندنەوەو نووسینی نی‌یە بەلام ئەمەی بەلاوە گرنگ نەبوو چونکە (میستەر فۆمەن) خۆی ڕێزمەندو بەنرخ بوو، هەروەها کڵێساکەشی بەپاکی ڕادەگرت، کە ئەوەش کارێکی باش بوو.

بەلام لەژیاندا هیچ شتێک تاسەر وەک خۆی نامێنێتەوە، قەشەکە تەواو پیربوو تاوای لێ‌هات ئیترنەیتوانی بەکاری خۆی هەستێت ناچار کڵێسای (سانت پیتەرز)ی بەجێ هێشت.

قەشەیەکی نوێ هاتە سانت پیتەرزەوە ،ئەم قەشەیە گەنج بوو ویستی زۆر شت بگۆڕێ.

(میستەر فۆمەن) قەشەی تازەی خۆش نەدەویست بەلام گوێ ڕایەڵی دەکرد لەبەرئەوەی ڕێبازی تازەی گرتەبەر.

قەشەکە هەمیشە پێ‌ی دەووت: [ئاوامەڕۆبەڕێوە]، [بەم شێوەیە بڕۆ بەڕێوە] . . .[ئاوا مەوەستە بەپێوە] ،[بەم شێوەیە بوەستەبەپێوە].

(فۆمەن) هەموو شتێکی گۆڕی، (بەلام) شتێک هەبوو کە نەدەگۆڕدرا ئەویش ئەوەبوو (ئەلبێرت نەی دەتوانی بخوێنێتەوەو بنووسێ.

لە پاشان قەشەی نوێ بەمەی زانی، ڕۆژێک لە دوای ئاهەنگێکی مارەبڕینی گرنگ، قەشەگەنجەکە دەستی‌کردبە دووان لە گەڵ (ئەلبێرت)دا:

- چەند ساڵە تۆ خزمەت چیت لە کڵێسای سانت پیتەرز؟
- شازدە ساڵە . . گەورەم.
- مانای ئەوەیە کەتۆ شازدە ساڵە خزمەتچی کڵێسایت. . کەچی ناتوانی بخوێنیتەوەو بنووسی؟
- ئەمەڕاستە. . من لە خێزانێکی هەژاردا لەدایک بووم. . باوکم و دایکم نەیان توانیوە من بنێرنە قوتابخانە . . لەبەرئەوە هەرگیز فێری خوێندنەوەو نووسین نەبووم؟
- بەلام ئێرە کڵێسایەکی گرنگەو پێویستە خزمەتچی کڵێسای (سانت پیتەرز) بتوانێ بخوێنێتەوەو بنووسێ.

- توداوات لەمن کرد کە زۆرشت بگۆڕم، منیش بۆ ڕەزامەندی تۆ زۆر شتم گۆڕی. . بەلام من هەرگیز ناتوانم فێری خوێندنەوەو نووسین بێم، لەبەرئەوەی من ئێستا بەرەوپیری ئەچم و تەمەنی خوێندەواریم لەوەتێ پەڕی‌کردووە کە بتوانم هەندێ شت فێربم.
- تۆ پێویستە فێری خوێندنەوەو نووسین ببیت، یا نابێ خزمەتچی کڵێسای سانت پیتەرزبیت.

(ئـەلبێـرت فۆمـەن) پیـاوێکی ڕێـزمـەنـدبـوو. . چەندە هەوڵیدا قەشەی نوێ ڕازی بکات بەڵام بێسوودبوو، بۆیە ناچار بە قەشەی ووت:

- لەکـۆتـایی ئەم مانگـەدا ئێـرە بەجێ دێڵم . . پێـویستە خزمـەتچی یـەکی نوێ بدۆزیتـەوە. . پیـاوێکی‌تر بدۆزمەوە . . منیش کارەکەی فێردەکەم.

ئەلبێرت شەو باشی لێ‌کردو بەڕێزەوە کڵێساکەی بەجێ هێشت هەرچـەنـدە هیـچ پەست نەبـوو بەڵام هەستی بـە ماتەمینی دەکرد. .

ملی ڕێی گرت بەرەو ماڵەوە. . بەدەم ڕێگاوە پرسیاری لەخۆی کرد:

- ئاخـۆ خێـزانـەکەم چی بڵێ؟ لەوانەیە پەست و وەڕس ببێت کاتێ ببیستێ کارەکـەم لەدەست چووە. . پێـویستـە کارێکی نوێ بدۆزمەوە. . بەڵام ئەمە کارێکی‌وا ئاسان نی‌یە. .

(ئـەلبێـرت) جگـەرەی زۆر نەدەخـوارد، بەڵام لەوکاتەدا حەزی لە جگەرەیەك دەکرد، لە دڵی خۆیدا ووتی:

- پێـویستـە پاکـەتێ جگـەرە بکـڕم . . بەڵکو جگەرەیەك بکێشم بۆ ئەوەی باشتر ببم.

بەدەم ڕێگـاوە ئەگـەڕا بۆ دووکـانی جگــەرە فرۆش، بەدرێـژایی شەقـامـەکە کەچەندەها دووکانی نانەواو گۆشت فرۆش و پێڵاو فرۆش و شەبقە فرۆشی لێ‌بوو. . بەڵام هیچ دووکانێکی لێ‌نەبوو کەتووتن یاخود جگەرە بفرۆشێ!.

ئەلبێـرت بە درێـژایی ڕێگـاکە تاماڵەوە هیچ دووکانێکی جگــەرە فرۆشـی بەدی نەکـرد. . کاتێ گەیشتــە ماڵــەوە بەخێزانەکەی ووت:

- کارەکەم لەدەست چووە:

- کارەکەت لەدەست چووە!؟. . بۆچی؟

- قەشــەی نوێ خزمــەتچی یــەکی دەوێت کە بتــوانێ بخوێنێتەوەو بنووسێ.

- بەڵام تۆ بەتەمایت چی بکەیت؟. . تۆ ئێستا لەسەروو چل ساڵی‌یەوەیت و ناتوانیت کارێکی نوێ بدۆزیتەوە بەئاسانی. .

ئەلبێرت لەوەڵامداووتی:

- بیـرم لەشتێ کردوتـەوە. . لە ڕێگـاکـەما بەرەو ماڵەوە، دەم ویست جگەرەیەك بکێشم . . بەڵام بەدرێژایی ڕێگاکە هیـچ دووکـانێکی جگـەرە فرۆشی لێ‌نـەبـوو. ئایا چەند خەڵکانی تریش پێویستی‌یان بە جگەرەهەیە لەم ناوچەیەی لەندەن دا؟

خێزانەکەی وەڵامی دایەوە:

- بێ‌گومان خەڵکێکی زۆر.

- بەڵام کەسیــان لەوێ جگــەرەیـان دەست ناکـەوێ:

. . باشە چەندە پارەمان پاشەکەوت کردووە؟

ئەلبێـرت و خێـزانـەکـەی لەبـەرئـەوەی هەمیشـە ئاگایان لەپـارەوەبـوو، هەمـوو هەفتەیەك هەندێ پارەیان پاشەکەوت دەکرد. کاتێ پارەکەیان ژمارد ئەلبێرت ووتی:

پارەکەمان بەش دەکات:

خێزانەکەی خێرا پرسیاری‌کرد:

بە شی‌چی دەکات؟

- بۆ ئەوەی دوکانێکی جگەرە فرۆشی پێ بکەینەوە.

لەکـۆتـایی مانگ دا (ئـەلبێـرت فۆمـەن) بەیـەکجـاریی (سانت پیتەرز) ی بەجێ‌هێشت، دوکانێکی کردەوەو دەستی کردبە جگەرە فرۆشتن.

لەبـەر ئەوەی دووکـانـەکەی تاکە جگەرە فرۆشتن بوو لەو شەقـامـەدا، خەڵکێکی زۆر ڕوویـان دەکردە دووکانەکەی، وای لێ‌هات دەستی بەفرۆشتنی هەندێ شتی تریش کرد، بەڵام هەمـوو شتـەکـان هەربـۆ جگـەرەخـۆرەکـان بوون. . ئەلبێـرت توتنی‌پـایپ و جگـەرەو شقـارتەشی دەفرۆشت. . تادەهات هەموو هەفتەیەك دووکانەکەی زیاتر قەرەباڵغ تردەبوو.

لەپاش ساڵێك دووكـانـەكەی ئەلبێرت پارەیەكی چاكی پەیدا كرد . . لـەپاشـا ئەلبێـرت بیـرێكی تری كردەوە! . .
رووی‌كردە خێزانەكەی‌و ووتی :
بۆچی ئێمە دووكانێكی‌تر نەكەینەوە؟
خێزانەكەشی بەمەرازی‌بوو.

ئەلبێرت فۆمەن بەناو لەندەن دا گەڕا تاشەقامێكی درێژ ی قەرەباڵغی دۆزی‌یەوە كە دووكانی جگەرە فرۆشی تێدانەبوو. .

ئەلبێــرت دووكــانێكی لەو شەقــامــەدا كردەوە پیـاوێكی گەنجی خستـەســەر لە دووكــانــەكــە ئیشی بۆ بكـات . دووكـانـەكـە بە خێـرایی پەرەی سەنـدو زۆر قەرەبـاڵـغ بوو . . بەم شێوەیە ئەلبێرت یەك لەدوای یەك كۆمەڵێ دووكانی كردەوە .

لەپــاش دە ساڵ بوو بەخـاوەنی (دە) دووكـانی جگـەرە فرۆشتن، كە هەریەكەیان زۆر قەرەباڵغ بوون، بەم شێوەیە ئەلبێرت هەموو هەفتەیەك زیاترو زیاتری پارە دەخستە بانقەوە .

رۆژێــك (ئـەلبێـرت)ڕ ێی كەوتـە بانق و فەرمـانبــەری بانقەكە پێی‌ووت :

- ببــوورە . . بەڕێــوەبــەر دەیـەوێ بت بینێت . . ئـایـا دەتوانی ببینیت؟

- بێ‌گومان .

ئەلبێــرت ڕووەو ژووری بەڕێــوەبــەرەكـە ڕۆیشت، بەڕێوەبەری بانقەكە ویستی لەبارەی پارەكانی‌یەوە بدوێ، ووتی :

- تۆ ئێستا پارەیەكی زۆرت لەبانقداهەیە .

- بەڵێ دەزانــم . . من پێــویـستـم پێ‌ی‌نی‌یــە باهــەر لەبانقدابێت . . پارەكەم لێرەدا پارێزراوترە .

بێ‌گومان پارەكەت لە بانقەكەماندا پارێزراوترە . . بەڵام بانق قازانجی زۆر نادات لەبــەرئـەوە تۆئـەتـوانی بیخـەیتـە ئیش و كارەوەو هەندێ (بەش)[2] بكریت لەهەندێ ئیش و كاردا بۆ ئەوەی پارەیەكی زۆرت دەسكەوێت .

من هەرگیـز بیـرم لەو شتـانـە نەكـردۆتـەوە كەتـۆ باسیان دەكەیت كەواتە پێویستم بەیارمەتی‌تانە .

- كەواتە من یارمەتیت دەدەم .

پارچـەیـەك كاغـەزی دایـە دەستی (میستـەر فۆمەن) كە هەندێ نووسینی لە سەربوو ووتی :

ئالێـرەدا مۆرێ بكـە . . دوایی دەتـوانم هەمـوو یارمەتی یەكت بدەم .

ئەلبێــرت پانــدانـەكـەی بەرزكـردەوەو هێڵێكی درێـژ ی لەخوارووی كاغەزەكەوە كێشا، بەڕێوەبەرەكە پرسیاری لێ‌كرد :

- بەڵام ئەم نیشانەیەت بۆچی دروست كردووە؟ بۆچی هەر یەكسەر لەگەڵ ناوەكەی خۆتا مۆرت نەكرد!

ئەلبێرت زۆر بەئاسانی وەڵامی دایەوەو ووتی :

- لەبەر ئەوەی من نازانم بخوێنمەوەو بنووسم!

بەڕێوەبەرەكە لەسەر جێگەكەی، خۆی كێشابە پشتاو ووتی :

- تۆ پیاوێكی دەوڵەمەندی . . كەچی تائێستەش نازانی بخـوێنیتـەوەو بنـووسی؟ . . ئەگـەر تۆ توانـای خوێنـدنـەوەو نووسینت هەبوایە ئەبوویت بە ملیۆنێر .

ئەلـبێــرت فۆمــەن بە دەنـگـێـكی بەرز دەستی كرد بە پێكەنین، بەڕێوەبەرەكە زۆر سەری سوڕما . . (ئەلبێرت) ووتی :

- من بۆیـە دەوڵـەمـەنـدم (چـونكـە) نازانم بخوێنمەوەو بنـووسم! . . خـۆ ئەگەر بم زانیایە بخوێنمەوەو بنووسم ئەوا هەتا ئێستەش هەژار ئەبووم و ئەبوو[illegible] (نیڤل سكوێر) هەر خزمەتچی كڵێسای (سانت پیتەرز) بوومایە! . .

لەكتێبی
(The veger )
And Other short stories
By W. Somerset Maugham

کورته چیروکهك:

# کهدا دهستی




کومکرن و بهرههڤکرنا:
کارل هاینز
و
گیرت هونگر

وەرگیرات ژئەلمانی:
عبدالواحد عبدالله


لدەمێ بەرێ ئاسنگەرەك هەبو لدەڤەرا قەفقز دژیا، ئەڤی ئاسنگەری کێ گەلەکێ تەمبەل هەبو، ژبێ کوڕکی گەهشت بو دوازدێو پێهەل و تبلا برێ خوێ نەدکر، ڕوژێ [کویك][1] ەکێ بتنێ ژی کارنەدکر کەدا خودێ نەدکر نەبو خوەو نەبو مالا خوە. هەرچەند نەبێ نەخوش بو یانژی بێ بێهێزبو، لێ گەلەکێ ساخ بو ژگیانێ خوەڤەو بێ بزەندو باسك بو. چ هزرێت دی خود سەریدا نەدهلاڤێتن ژ بلی خارنێو ڤەخارنێو تەمبەلیێ، هەلبەت خەرجیا ویژی لسەر پارێت پیرەبابێ وی بون.

بابێوی مروڤەکێ پیرەمێرو ئەختیاربو ،ئێش و ئازارا خوە لبەر ڤەنساندبو هەما زەحمەتەك بکاری ڤەبربا دائێکسەر نەخوش بیت.

ڕوژەکێ بابێ کوڕکی نەخوش بو، ڤێجا نەشیا بچیتە کارێخوە نەچاربو کەتە ناڤ نڤیناو هزرێکر کو مرناوی یانێزیك بوی ژبەرهندێ گازی کوڕێ خوەکرو گوتێ:-

[ئەرێ کوڕێمن ئەز نزانم تو بوچی هندە مروڤەکێ تەمبەلی پانێ من ژیانا خوە هەمی بکارێ ڕەنج کێش و زەحمەت ڤە یابری ،لێ کوڕێمن، من باوەرە کو تو بکەدادەستێ خوە، خونەشیێ ئێك [روبل][2] ێ بتنێژی بینی.]

ئینا کوڕکی گوتە بابێ خوە:-

- [باب! [روبل] ەکێ بتنێ ئەز بکەدا دەستێ خوە برێنج بەرێ بینم ئەڤە نە چ و ڕەنج کێشانە ئەڤە تشتەکێ گەلەکێ بسانەهییە.]

ئینا بابێوی جارەکادی گوتێ:-

- [دێباشە بابو.. دێهەرە کوڕێمن ... هەرە (روبل) ەکی بینە گەر تەشیا تو بکەدا دەستێ خوە برێنج بەرێ توبینی ئەز دێ هەمی پارێت من هەین دێ کەمە ددەستێتەدا ودێ بوتەبن، لێ گەر تەنەشیا (روبل) ەکی بکەدا دەستێ خوە توبینی ئەڤجا تو خو تشتەکی نابەی ژپارێت من هەین.]

ئەڤ کوڕێ هندەیێ تەمبەل پێتڤی بو ئەوی چ کربا؟ وی گەلەك دڤیا مالێ بابێوی بگەهتەوی لێ ئەو بخوە گەلەکێ تەمبەل بو بو کارێو نەدکر. براستی نەگەلەکا بساناهییە.

کو مروڤ (روبل) ەکی بکەدا دەستێ خوە بینت گەر مروڤی د ژیانا خوەدا چ جارا (گویك) ەکی بتنێ ژی کار نەکربیت. و هەروەسا ئەوی نەدڤیا گەلەك لگەل بابێ خوە درێژ بکەت ژبەرهندێ هەچی تشتێ بابێ گوتبا دڤیا هەماوەسابا. دەیکا کوڕکی دلێوێ گەلەك ب کوڕێ وێ

ئەما جارەکێ کورێ لناف لیوانکا مالێ دیت و هێدی گوتێ :-

- [کـورێ من گوهـێ خوە بدێ! . . . ها ئەڤـە بوتـە (روبل) ەك. هەرە، هەر ژڤێ گاڤێ هەتا ئێڤاری بگەرێ لناف دارستانێ لرەخ گوندی، ئێڤاری لدەمێ توبیێەڤە هەرە جەم بابـێ خوەو بێـژێ کو من ئەڤـرو گەلـەك کارەکێ بزەحمەت پێ کریو ئەڤی (روبل) یژێ.

بدەف بابێ خوە هۆسـا تودێ مالـێ بابـێ خوە هەمیێ پێوەرگریو دێ بوتە مینت.]

براستی کورك بو گەریانێ ژی گەلەك پێ تەمبەل بو لێ ئەوی هەچی تشتێ دەیکـاوی دگـوتێ ئەوی وسـادکر. ئینا (روبـل) ژ دەستێ دەیکـا خوە وەرگـرت وهـاڤێتـە د بەریکا خوەداو چوو ناف داروبارێت رەخێ گوندێ، هەمی رۆژێ پێ پالـدایبـو لسـەر زویـرکێت رەخ و رویێت گوندی لناف داروباریو خارن و ڤەخارن دسەر سەرێ خوەررا دهاڤێتن و چیچك دهژمارتن لعەسمانی، ئێڤاری ژی ڤەگەریاڤە مال و چو جەم بابێ خوەو دەست هاڤێتە ئەوی (روبل)ی و کرە ددەستێ بابێ خوەداو گوتێ :-

- [ها! باب ها! . . . بگرە ڤی (روبل)ی، ئەو کارێ ئەو پێهاتی نەیێ ساناهیبو، هەستیەکێ ساخێ بتنێ ژی د لەشێ من دا نەمایە هندی من کارەکێ بزەحمەت پێکری ڤێجـا بەرێ خوە بدێ باب کانێ ئەز شیـام بکـەدا دەستێ خوە ئەڤی (روبل)ی بینم؟]

بابێ وی (روبـل)ژ کورێ خوە وەرگـرت، هو بوڤـی رەخی قولپاند د دەستێ خوەداو بورەخێ دی ژی (روبل) قولیـانـد، باش سەح کرە هەمی رەخ و ریێت وی، ژڤی دەستی هاڤێتە ددەستێ دیداو دیماهیێ هاڤێتە دناف سوپا ئاگریداو گوتە کورێ خوە:-

- [نەخێر کورێ من، تە ئەڤ (روبل) ە برێنج بەرێ نە ئینایە].

کورکی چ تشت نەگـوت ئێکسـەر لسـەرێ خوە زڤریو چوو قەستا ژورا خوەکرو چوو سەر جهێت خوەو نڤست.

رۆژا پاشتـر هەروەکی رۆژا بەری هینـگێ دەیکـاوی (روبل)ەك داڤ کورێ خوەو گوتێ :-

- [کورێ من . . ئەڤرۆژی هەما هەر، هەرە سەر زویرکا لناف داروباریو لوێرێبە هەتا ئێڤاری، لدەمێ تو بێیە ڤە بو مال پێڤیە تو قەدەدەکا رێکی تو بکەیە غار هەتا تو باش خوەهدەی ڤێجا بابێ تە هۆسا دێ بدرستی باوەدکەت کو تە رۆژێ هەمیێ کارێ کری . . . دێ ڤێجا هەرە کورێ من هەرە. . . .]

ئەڤ گەنجێ هنـدەیێ تەمبـەل پێ پێنەخـوش بو خو بکەتە غارژیو خوەهدەتن. بەلێ پێتڤی یە چ بکەت؟ وی دڤیا پارێ بابێ بگەهتە وی. ئینا جارەکادی (روبل) ەدی ژ دەستێ دەیکا خوە وەدگرت و هاڤێتە د بەریکا خوەداو دەست هاڤێتە ئەو تشتێت ئەوی دڤیاین لگەل خوە ببەت ژخارنێو ڤەخـارنـێو چوو ناف داراوبـارێ لرەخ گونـدی و پالـدا لسەرگیای هەر ژسپێدێ هەتا ئێڤاری کارێ وی بو خارن و ڤەخارن و پالدان لناف گیای ، تڤاری هێژ رۆژی پەرێت خوە نە داهێـرینـە خار قەستـا مالێ کر، بەری بگـەهتـە مال بقەدەرەکێ کرەغار، ئینا خوەهداو سەرو چاڤێت وی هەمی ژخـوەێ تەربـون، هاتـە مال و قەستـا وێ ژورێ کر ئەوا بابێوی تێڤە، ئینا روینشتەخار لسەر دوشکی دژورڤە لجەم بابێ خوە دەست هاڤێتێ ئەو (روبل) ژ بەریکا خوە ئینادەر، ئەوێ دەیکاوی دایە ڤێو داڤ بابێ خوە:-

- [ئەڤرۆژی ئەز گەلەك گەلەکێ وەستیایم هەر ژسپێدێ هەتا ڤێگاڤێ وەکی کەرەکی من رێنج بەری یاکری، بەرێ خوەبدێ باب. . .

تو من دبیـنـی کانـێ من چەنـد یا خوهـدای!] بابێ (روبـل) ژکـورێ خوە وەرگـرت، وەکـی پێ دی باش سەح کریو ژڤی دەستی هاڤێتە د دەستێ دیداو دیماهیێ هاڤێتە دناف ئاگریدا وەکی پێ دی:-

- [نـەخێـر، کورێ من قەد تو نەشێی من سەردابـەی، ئەڤ (روبل)ێ کو تە ئینای ئەڤە نەب بکەدا دەستی هاتیـە

تە چ یە تەهندە خوەهدایە؟ ! تە بەس یا کریەغار ژسەر زویرکا هەتا ڤێریٚ و ژ بەرهندیٚ تە یاخوهدای. ] ڤێجا ئەڤ کوریٚ هندەیٚ تەمبەل چ کر؟ کورکی کرەکەنی‌و گوت:-

- [نوکە گەر تەنەڤێت ،ڤێجا تو ژمن باوەرناکەی. ]

کورك جارەکادی ئێکسەر زڤری‌و چوو دژورا خوەڤەو پالداو نڤیست. ئەڤ کوریٚ تەمبەل کەتە د نڤیستنەکا کویردا لیٚدەیکا رەبەن دهزرو بیرادا بەرزەبو خەولیٚ ڤەهەرمی‌و هەر دداسەر هزرا خوە کو ئێدی کەسەك بابیٚ کورکی نەشێت سەردابیەتن. براستی ئەویٚ پارە ددانە کوریٚ خوە چ قازانج و باشی لیٚنەدکرن. رۆژا پاشتر دەیکا کورکی لگەل ئاخفت و گوتیٚ:-

- [کوریٚ من گوهیٚ خوە بدیٚ! پێتڤی‌یە تو ڤێگاڤیٚ بدرستی رێنج بەریٚ بکەی داتو، مالیٚ بابیٚ خوە بخو بستینی، ڤێجا ئەم ئێدی نەشێن بابیٚ تە سەردابیەین هەرە هەر رۆژ هندی تو بشێی بلانیٚ هندبیت، بلانیٚ هەر رۆژ بەس (سومە)[3] یەکی بینی بکەدا دەستیٚ خوە هەر ژ هەینیٚ هەتا هەهینیٚ هەمی پێکڤەدیٚ بیتە (روبل) ەك تە کارکری. ]

ئەڤ کوریٚ تەمبەل پێتڤی بو هەر تشتەك کربا ژ بەرهندیٚ زێدەتر چ رێنەبون .بیچ بیچە دەست هاڤێتە کاریٚ خوە، قەدەرا هەینی‌یەکی هەر رۆژ هندەك سەعەتا وی کار دکر، لڤێریٚ ئەڤ تشتە ژڤی هەلگرت لوێرا هە لگەل وێهە ،یێ دی هندەك کارکر هەروەسا بخوە هێدی کارکر، هوسا بخوە پارە کوم کرن هەتا بوبنە (روبل) ەك، پشتی حەفتیەکیٚ بخوە کاکری، پارێت خوە کومکرن و چوو جەم بابیٚ خوەو (روبل) ەك و هندەك ... ردە دانەڤ بابیٚ خوە. جارەکادی بابیٚ وی باش تەماشەی ئەو هیردیٚ ئاسنی‌کر [روبل ەك و هندەك هیردەبون] ئێکسەر بابیٚ وی گوتیٚ:

- [نەخێر کوری من تو جارەکادی من نەشێی سەردابیەی ئەڤ پارە نەب ی‌کاری هاتینەو تەبکەدا دەستیٚ خوە نەئینااینە! ]

- بابیٚ وی پشتی ئەڤ ئاخڤتنە گوتینە وی دەست هاڤێتە ئەو پارێت وی ئینایین و هاڤێتنە دناڤ ئاگری‌دا ،لدەمیٚ بابیٚ پارێت وی هاڤێتی‌نە دناڤ ئاگری‌دا، کورك گەلەك تێك چو و ئێکسەر خودناڤ ئاگری وەرکرو بدەستا لپارێت خوە گەریا ژناڤ ئاگری:-

- [تە چ کر باب! من حەفتیێ هەمیێ ئەڤ پارەێت بکەدا دەستیٚ خوە کوم کرین من خوینا خوە یا بڤان پاراڤە خاری‌و تو بیٚ رادبی دسوژی! ]

ئینا بابیٚ وی بەریٚ خوەدا بیٚ‌و گوت:-

- [کوریٚ من ڤێگاڤیٚ من ژنوی باوەرکر کو تە ئەڤ پارەیە بکەدا دەستیٚ خوەیێت ئینایین، کوریٚ من تە چ بها نەددا بپارێت بیانی ژ بەرهندیٚ تە ب چ ڤە نەد گرت .ئەڤ پارێت تە بکەدا دەستیٚ خوەو برێنج بەریٚ برەنج و هێز باسکێت خوە ئینایین، ژ بەر هندیٚ تو دیٚ بو تورەبی‌و دیٚ خوە هاڤێژیٚ ژناڤ ئاگری ئینیەدەر دەمیٚ ئەز دهاڤێمە دناڤ ئاگری‌دا، کوریٚ من هزرا خوە بکە:

گەر تو بدرستی رێنج بەریٚ بکەی هندی پارە تەبڤێن دیٚ تە هەبن و هێژ پتر، لیٚ گەر تو بدرستی کارنەکەی تو پارێت بیانی نابینی‌و تەنابن. ]

ئینا بابیٚ وی هەمی مالیٚ هەی کرە ددەستیٚ وی‌دا، پشتی هینگیٚ بابیٚ وی چوو وی ولاتی ئەویٚ رێیا ڤەگەریانیٚ بو نەبیت.

تێبینی:

1 - کویك: جورەك پارەیە

2 روبل: ئەوژی هەر پارەیە ژ (کویك) زیدەترە

3 - سومە: ئەوژی پارەیە هێژ ژ (کویك)ی کێمترە.

ژێدەر

Deutsches Lesebuch fur Auslander

VEB VERLAG ENZYKLOPAIE

LEIPZIG 1970

# پارچەیەك لە شیعری لوری



داری ساری

سەوزە تەیار کرد سەوزەتەیارکرد.
سەوزەکەرستەی جوانی تەیار کرد
زلفەش بەشانەگ زرین تیمار کرد
ویەش ئامادە پی جەژنی وهار کرد

★ ★ ★

سەوزە بەسورمەگ دو دیدەش کاڵ کرد
بربەی چیۆ کەمان گوشەی چەلال کرد
نازگی لێوەش بەدییەرەم ئاڵ کرد
لەدشتی سەودا ویش وەفەزاڵ کرد

★ ★ ★

سەوزە ئەوریشەم لەشان وچل کرد
زنگوڵەی زرین پی گیس چاپڵ کرد
هروو.پی ژیان تازەی تەردڵ کرد
ریگای هامەشو دوس ومەنزڵ کرد
گۆلوەنی سەرپوش چەتر وقاقل کرد
لەدنیای عەشقدا شیت عاقل کرد
سەوزەیی دیدار دوسەش تاقل کرد
وییرش لەسارای سەودا وعەشق وەڵ کرد

★ ★ ★

سەوزە دوجارە دنیای ژین نوکرد
لەدنیای دلداری تازە هروو کرد
جەسەی شمشالەش بەم شك خوەش بۆکرد
مەنزلگای یاران وهامەشو کرد

★ ★ ★

دس بەگورانی هوررەی سروو کرد
کەرستەی رەنگ ریژ جوانی کوو کرد
پی‌زلفەش ئەقراج وتان وپۆو کرد
سەوزەیی دنیای ژیان هرووکرد

تەیار ئامادەبون
هروو گەرانەوە
ویش لەخوەیەوە
قاقل برز پرج
سروو نەرم گوژنی
ئەقراج پارچەی سیەمدار

# گەر بووكم بیت

## پێشكەش بەوانەی كە لەمانای شیعری «گوڵ و یاد» نەگەیشتن

گەر بووكم بیت، لەپەڕ پەڕەی دڵا
دیدەكانم
نوێنی بووكێنیت بۆ ئەكەم
بۆ حەوتەكەت،
سەر جێگاكەت،
بە پەشم و لە پۆپەشمین
بە جاجمی گوڵنگە سمین،
بۆ ڕائەخەم
تان و پۆكەی
تاڵە تاڵەی دڵ ئەكەم!
لە چرۆی سەرپۆپەی چڵا
گەردانەت بۆ ئەهۆنمەوە
لەچاڵایی چەناگەتا
تامردن، مەی ئەخۆمەوە
لە هێلانەی گەرمی دڵا
نۆماڵی زاوایەكەمان، ئەنەخشێنم
گلێنەكانم كە «دوو مووروو»ن بۆت دەردێنم!
بەگۆی گوارەكەتیا ئەكەم
لە خونچەی لێوی بزەدا
بۆنی گوڵاوت بۆ دێنم
لە گوڵدانی دیدەكانما
گوڵی یادگاریت ئەڕوێنم
گەر بووكم بیت
لە (كەوڕەو)ی بەلەنجەتا
لەبەر پێو، بەر پەنجەتا
من برژانگت بۆ دائەخەم
كەدەست بشۆی
ئاوی چاوانم ئەگوشم
بەهەردوو دەستیا، ئەكەم.
كە بم دوێنی، بانگم بكەی،
هەزار چورتم، ئۆخەی، ئۆخەی!
دەستەو نەزەر



**محمد أمين پێنجوێنی**

لەپەنجەو تاکو تەوقیسەر
چاوەڕێی فەرمانت ئەکەم!
گەر بووکم بیت،
ئەیقژ گزنگی ئێواران
ئەی چاو ئەستێرەی دوای باران
وەی ڕوو سامالّی دوای بەفر
برۆکانت: مانگییەك شەوەی
ناو دەمی کەلی سەر پێچراوی کلاّفەهەور
بالاّ چنار:
من تۆم لەلا مەبەست ترە
لەهەناسەو لە ئاوو نان!
سوێندم بە «خوا» هەزاران جار
ئەی قژ زەردی بالاّ چنار
باوەڕ بکە هەزاران جار



پیربال محمود

دوێنێ پێی ووتم: من لە نێوخەمم
من پەشیمانم؛ من لە نێو تەمم
من ئێستا لێرە بەبێ هوگرم،
من ئێستا لێرە بە بێ هاودەمم

ناحەزبوو ئەوەی تۆی خستە ئازار،
تۆی بەستەوە بەگوریسی خەمم
گەر باوەڕ ناکەی فەرموو بپرسە
لە ئەشکی زۆرو لەخەوی کەمم
پێم ووت: دەی برۆ، نەگەڕێتەوە
بۆ ئێرە، نەکەی بێیتەوە چەمم
نەکەی پێم بڵێی: هەر یارەکەی تۆم،
هەر لەسەر گفتی خەوم و قسەمم
تۆ (مەم)ی ئەمن (زین)ی بالآی تۆم
تۆ (وەلی)ئەمن بۆ شەوت (شەمم)
من تۆم ناسیوە، زانیومە تۆ چیت؟
چیت ناوەتە ناو یادەی بەردەمم
من تێژ بووم لەمە، لەم تالآویە،
چیتر لە مەولا نابێتە ژەمم،
مەڵێ: بەهرەکەت! نانە خێر بەهرەم





نەماوە، چکا بەهرەی ساغلەمم
سەیرکە ناخی گۆزەلەی دەستم
نەمایەی زۆرم ماوەنە کەمم
درۆت مەڕێژ نێو گوێم، دا کاوی دەمێکە
درۆت ناکەمە زاخی نەخەمم
نەتۆ وەك جاران (زین) کەی دڵمی،
نەمن وەك جاران بۆ دڵت (مەمم)
تۆ لە حەزناگەی هێشتاکە زاڕۆی،
ڕەوای تۆنی یە حەزی مەردەمم
من ڕاستم، بڕوام بەڕاستی هەیە
لەسەر زێی ڕاستی دەڕوا بەلەمم
من گەوهەری خۆم نادەم بەخەلووز
گەر بێت و بیدەم کەمتر لەکەمم
لە خۆشەویستی چاوگەی ئایینم،؟

نموونەی گەنجی چەرخی بیستەمم
مەڵێ: نیشانەت هێشتاکە ماوە
لیرە، لە تەڵی قژو پەرچەمم
پەرستگەم ئەتۆی، ئەتۆی پەیکەرم،
ئەتۆی بتخانەی بت و سەنەمم
نەخێر بڕوای تۆ ڕاست نی یە گیانە،
خوارە، هەر وەکو پایەی سێسەمم
مەڵێ: خاوێنم وەك گوڵی یانە،
پاگژم، نەوەك پیس و ستەمم
ڕۆشەنم وەکو تیشکی مانگی پڕ،
پیرۆزم وەکو گیانی (مەریەمم)[1]
ئەو شۆخەی کە وا دوێنێ ئاوا بوو
ئەمڕۆ وا نی یە لە نێو بەرهەمم
بسڕەوە ئەشکی چاوی فیلاویت
فێڵە، نابینە پێچ و مەرهەمم
نە تۆیار، نە من تازە لاوی تۆم،
نە تۆ (لەیل) نە من (قەیس)ی دووەمم
دەمێ ڕەنجم دا لە پێناوی تۆ،
بەفیڕۆ ڕۆیی ڕەنجی ئەو دەمم
تاکو بڕواکەی فەرموو بخوێنە
نامەی یەکەم و نامەی سێهەمم
تۆمارم ئەوەی ئەڵێ: (کوڵدارم،)
نیگارم ئەوەی ئەڵێ ماتەمم
یادداشی حەزی دڵێکی کۆنم،
ڕووگەی سەرنجی هی ئەووتەمم
هەموو چرا بۆ وەفاداری
ووشەی بەتامی نووکی

(1) مەبەست لە (وەلی) وەلی دێوانەیە، مەبەستیش لە (شەم) یارەکەیەتی.

(2) دایکی پیرۆزی (مسیح)ە

# گەشتی بەیانی

جەزا عەلی ئەمین

بەیانییەو
دڵۆپە ئاونگی نیسانێ
دەتوت میوانی تازە باریوی چەمەن جارن
بەدەم دیلانێی دەستە نەرمەکانی «با»وە
ملیۆنان ئاوێنەی ئاو
رووی بزە هێنان تێ دەکردم
تاکو گەردی دڵم بشۆنەوە
تا، وەکی کۆرپەیەکی ختووکە دار
بمخەنە سەر سەودای خەنینەوە

★ ★

منێك کوژ راوی لوتکەکانی سپیدە
شەیدای چاو داگرتن لە ئەستێران!
سەر گەرمی، بژاردنی [illegible]ەوە زریویان
مەستی خۆشتن لە سوورایی خۆر نشیندا
تا رەنگی دەگرم!
دەست راکێشان، بۆ دوورترین کلاوە بەفری
چیایان
تا بیکەمە سەر رۆح!
گەڕان بە با خاندا
تا، گوێم لە زۆرترین ـ دەنگی پشکوتنی گوڵان ـ بێ
تا بە هەموویان
ئاوازێکی خەیاڵ هێن و
مردو کوژ یان لێ پێك بێنم!
بەڵام کوا!

★ ★

ئەم بەیانە
کاتێ کچە با
بەبان سەرو بسکی
ئەو پەلکە گیا تەڕو برانەدا دەگەڕاو
دەگەیە لام
وام دەهات بەیادا
گیان، کراسی گوڵێنی پۆشیوەو داینانێ:
ئەمرۆ
دەڵێی لە دۆزەخی دڵما
شایی ڕەنگ و بۆن دەگەڕێ
دەشتی ئەوبەر پردەکەی قلیاسان
ناسکە خێوەتی جوانی هەڵداوە
باڵای گەنم و جۆ
بەدەم هەنا سەی «با»وە دەشەکایەوە
تاو نا تاوێ کە لە خۆرەکە دەگیرا
دەتوت دەریایەکی سەوزە!
کاتێ تیلەی چاوم لێی دەدرا
نیگای لێ کەسك دەکردم!
لە ناکاوێکا
سەر دەمی «گۆران»م هاتەوە یاد
دار چوالەکانی ئەوسام دەدین
«وەك بووك لێویان لە سووراو نابوو»
لە ئاوا بۆیان گەڕام
تا خشپەی پێی «گۆران» و
سەرنجە گەرم و تا سە دارەکانی
وەك ماسی ڕاو کەم:
چەم، بێ وەرام ملی دەنا

دەتوت دزە! بێ هەست دەڕوا!

★ ★

گەر تەمەن ئیمڕۆ نوێ نەبێتەوە
گیای نەمرێتی لێ نەڕوێ
دەیسا خۆی بۆکەی هەڵگرتووە!
بەڵام چۆن بەقا بکەم
منێك لە قوڕی دڵتەنگی دروست بووم
هەزاران ساڵە بێ پشوو
بارانی زیزیم بە سەردا دەبارێ
کە چی ئەوڕۆکە
کاروانێکی سووك باربم
گوێم تەپ
لەو ملێونان هاژەی گریانە
نەبین، لەهاند کەلەبەری
ئەو زامانە
کوژ رانی گەرمە نیگای
نۆ بووکان
مەست و کەلەلا
لە ئاقار هەرچی وا دزێوییەو
لە بان دیمەنەکانی ژ یاندا
بۆتە ژەنگ
ئێستا لە بەر چاوما
گوڵ و گیا
بە هناسەی ئەسپایی «با»
تێك دەئاڵێن
دەتوت دۆستی دێرینەن و
لە مێژە لێك دابڕون!
وەکی کەوە نیگاو هۆبەکانی جوانیت
هەر لە ناویا ئەفرن و لانادەن
لە بان لقێ هەڵنانیشن
دەڵێن نەکا
گەڵای ئەو بەر
نیستێ ئەمبەر لێم بتۆرێن!

ئەوەتا سروە
دزە ماچی خۆی هەڵدەگرێ
بەرامەکەی
فێنکییەکەی
بۆ بن کەپرو کەرە نسێیان دەبا!
تا دنیا بە بۆن خا
ئێی دیدەن!
پێش ئەم هاتوچوونە

قینم لە هەموو گەنم ڕەنگەکانی دنیا دەبۆوە
هیچیانم نەدەبوارد
بەڵام ئێستا
داوای لێبوردن لە گشتیان دەکەم
تاوێکی دی
من ڕووەو لای
مناڵە تازە قەڵەم گرتووەکانی «دێرین» و
تۆش بۆ بن سێبەری ئەو گوڵانەی
هێشتان قەڵەم نافامن
هێمان تەختە ڕەش نەناسن
منیش لە بەرامبەرتەوە دانیشتووم
لە پێچەکەدا دادەبەزم
بەڵام سینەم کۆگایەکی جادوییە
هەموو تاقەکانی پڕن لە هەناسەی گوڵینی تۆ
ناهێڵم لە دەروونم بێنە دەرێ
ئێستاکێ کۆگای دڵ گوڵجارێکە
هەموو ئەو گەردن زەردانەی. . جارێ لە جاران
تەوقەی چاوم لەگەڵ ک[illegible]ن
هاتوون
بە هەردو دەست
بە هەردوو لێو
لە دەروونما گوڵی شۆخیت دەفرۆشن
دەخوازم هەر خۆم
یەکەم کڕیارو دوا کڕیار بم!

# هەڵوێست



رووت و قوتم
لەبەر نەرمە بارانێ، لەبەر شەستە بارانێ
نە دانە چۆقەمەو نە چۆکم دەلەرزێ
ئەم خاکە بۆ وا ترسا؟!
سەیرە، !!چەند بەمشکە!
هەر دەڵێی بێ کتکە
گەڵای وەریو وسەگ خۆیان مات کرد
چەتریش بارگەناگرێ
ئەوەی لەبن چەترایە گەمژەلە
ئەگینا چەتری نە دەهێنا
باران منی شوشت
بەردو شاخ و دارستانی شوشت
سەربانی چاخانەو مزگەوت و دیوەخانی شوشت
ئەوها! کە باران برا، منی ئازا
لەجێدا کەوتم، وبردمیانە گۆڕستان

هۆنراوە /ع.ع. یوسف

# دەنگی شیعرو شاعیریەتی

# لەجارێکی تر خۆرباران دا..

محەمەد خدر مەولود

ئەم باسە لەوەرزی رۆشنبیری دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکراوەی کوردی لەهەولێر لەمانگی نیسان پێشکەش کراوە . . .

لەدوادواییەکانی ساڵی 1984 ، ئەنوەر مەسیفی شاعیر کۆمەڵە شیعرێکی‌تری بەناوی ـ جارێکی‌تر خۆرباران ـ بە چاپگەیاند.

جارێکی‌تر خۆرباران بیست وهەشت شیعری درێژو کورتی گرتۆتە خۆی، هەموویان لەنێوان ساڵانی 1979 وە تا 1983 نووسراون . ئەم نامیلکە شیعرییە دووەم بەرهەمی کاك ئەنوەرەو لە ساڵی 1979 یەکەم بەرهەمی بە ناوی ـ خۆرباران ـ بڵاوکردەوە.

شایەنی سەرنج دانە دەستەواژەی ـ خۆرباران ـ دوو واتای هەیە یەکەم: خۆڵ باران، واتە بارینی خۆڵ . دووەم : بەهاران جاروبار لەوکاتەی کە بەشێکی ئاسمان هەور دایدەگرێ تەنیا شوێنێك نەبێ لەوێش رۆژ ستونی دێتە خوارێ.

بۆ ناوی هەردوو دیوانە شیعرییەکان مانای دووەمی ـ خۆرباران ـ بۆتە مەبەست و ئامانجی شاعیر.

شاعیر لەم بەرهەمەیدا وێرای بوونی (هەندێ کەم وکوڕی و هەڵەو کامڵ نەبوونی هەندێ شیعر) توانی وەك شاعیرێکی رەسەن شوێن پێی خۆی لەسەر نەخشەی شیعری ئەمڕۆی کوردی‌دا بکاتەوەو واش لە خوێنەر بکات بەحەزەوەچاو ببرێتە ئاسۆی شیعری داهاتووی.

خۆمولکایەتی کردنی شاعیر:

قۆناغی یەکەم: ئەنوەر بەر لەوەی شاعیر بێ مرۆڤە . . مرۆڤیش لەچاو ژینگەو گەردوون گۆرانی مەزن گۆتەنی ـ گەردێکی بچووکە ـ بەڵام هۆش و بیروای لێ‌دەخوازێ بوونێك بۆ خۆی مسوگەروداپێن بکات . .

ئەو بوونەی شاعیریش بەدوایدا سەرگەردان و عەوداڵ دەبێت ئاسمان و رێسمانی جیایە لەگەڵ بوونی مرۆڤێکی ئاسایی، بۆیە شتە خودی‌و بابەتییەکانی شاعیر نابنە دووشتی سەربەدوو دنیای جیا‌لەیەکتری . . بەڵکو لە پرۆسێسی شیعرا ژان ویستێکی شاعیرن.

کاتێ شاعیر هەندێ شتی هەبێ‌و لەهەندێکی تریش بێ‌بەری بێت بەدوای بوونی نەبوونەکە سەرگەردان و لەگەران دا دەبێ:

تابلۆیەکم بەفرم هەیە
هەتاوی نێو ئەسپینداران

**تیشکه زیوینی مانگەشەو**
**بەڵێ‌هەمە، هەتا دوای.**
**ئەوەی نیمە چوارچیوەیە. .«ل ـ 37 ـ»**

ئەم نە بوونـە وای لە ئەنـوەر کردوە بۆ مـسـوگـەرکردنی لە گەڕان و نەسرەوتن دابێ. . بۆیە ئەوی شاعیر خۆی دەکاتە باران و گڕو هەوار، تا بە سەرخۆی بباری، یا داگیرسێ وەیا کۆچەرێ ڕاوی‌کات چونکە لە ڕاوکردن و داگیرسان و بارینا کارەکەی بۆ مەیسەر دەبێ.

**خۆت کردە گڕ دانەگیرسای**
**خۆت کردە باران و بەسەر خۆتا باری دانەمرکای**
**تاسای‌و بووی بەهەواری**
**نەکۆچەرێ ڕاوی کردی**
**نەزریانێکی هاریش هات بتخنکێنێ.«ل ـ 6 ـ»**

قۆناغی دووەم: لەقۆناغی یەکەمدا خستمانە بەرچاو کە شاعیـر بۆ خۆمـولکـایـەتی کردن لەنـەسرەوتن دابووە. . لەم قۆنـاغـەدا کە قۆنـاغی دوای گەڕانـە بە چەشنێـك خۆی دەدۆزێتـەوەو خۆی مولکـایـەتی دەکـات. ئەم چەشنـە خۆمولکایەتی کردنە بە ئازار دۆستی ـ مازۆفییەت ـ دێتەدی.

واتـە خۆی ئازار دەداو تەنـانـەت ئامـادە دەبێ خۆشی بکوژێ . لەمەش دا بکوژ وکوژراویەك کەسن و جوێ نین.

**شەوان خۆم بریندم (ل ـ 6 ـ)**
**خۆم کوشت و**
**سەری مردنی خۆم بۆ کۆشك هێنایەوە . . . (ل ـ 8 ـ)**

ژان پۆل سارتەر لەم چەشنە خۆمولکایەتی کردنە دواوەو لە ڕوانگـە فەلسـەفییـەکـەی تیشکی فەلسەفی خستۆتەسەرو شیکـردۆتـەوە (خۆ ـ ئازاردان، واتە: خۆمولکایەتی کردن و داهێنانەو لەهەمان کاتیشا دارمانە . .)

دارمـانـەکەی ئەنوەریش لەوەوە دێ کە لەبوون و نەبوون بەگـومـانە بەڵام گومانەکەی بەرامبەر بەخۆیەتی، واتەکێشەو ملمـلانێـکـە ئەزەلی یەو بەخـۆێ لکـاوەو بەتـەواوەتی نەپەڕیوەتەوە نێو دنیای شیعرەکانی. .

دەشتوانێ کێشەکە بگوازێتەوە نێو شیعرو بیکاتە ماددەی باشترو باشتر بوون و بەرەوپێش چۆنی چۆنییەتی شیعرەکانی.

خەیاڵ و وێنەی شیعری:

دەمارێك لە شادەمارەکانی شیعر وێنەیە کە هونەرو گیانی شیعـری تیـا دەجـولێ شاعیـر بەهـۆیـەوە دەتـوانێ بیـرۆکەو دەستـەواژەو مەبـەستـەکـەی بە خوێنـەر بگـەیێنێ‌و بۆشی بەرهـەست و جەستـە بکـات. هەمـدیسان شاعیر بەوێنەی شیعری نێوە ڕۆکەکە پەرەپێدەکات و ناخی‌خوێنەریش دێنێتە جوولان.

شیعـر وێـرای بوونی ئیقـاع و مۆسیقـای نابێتـە شیعـر گەرووردەکـاری‌و جوانکـارییـەکـەی شاعیـر بەوێنـەکـە دیار نەبێت. . وێنـەکـەش چنین و توکمـەکـارییـەکەی بیرۆکەی نەگـرتبێتـە خۆی. کەواتـە لە وێنـەدا ناوەرۆك و ڕوخسـارو شێـوازی شاعیـر کۆ دەبێتـەوەو دەشتـوانـرێ لە ڕوانگـەی ئەوەوەش دەست ڕەنگینی‌و هونەرمەندێتی شاعیرە کە دەست نیشان بکرێت.

لە جارێکی‌تر خۆرباراندا گەلێ وێنەی لەم چەشنە بابەتە هەن کە هونـەرمـەنـدێتی‌و هەستیـاری شاعیـر دەنـوێنن . . وێنـەکـان چ وێنـەی مەجازی بن یاحسی کار لەخوێنەر دەکـەن و پاش خوێنـدنـەوەشیـان چوارچیـوەو ناوەرۆکـە چرۆپرەکەی خۆیان لەبیری خوێنەر جێ دێڵن.

**شەو هاوینێ خەوم نەهات**
**لەبن دیوارێ دانیشتم**
**کیژێ هێشتا نەنووستبوو**
**دیار بوو سنگ و مەمکی**
**خۆی دابووە ئەو ـ با ـ یەی**
**کە لە شاخەوە دەهات و بەسەربانان**
**دادەڕۆیی، هەتا خەو بردی یەو گوێم لێبوو**
**هەردەیگوت، توخوا ـ با ـ یەکە هەرووەرە**
**مەڕۆ بۆنی ئەوت لێدێ**

**(ل ـ 55 ـ)**

**بۆ چنینی وێنە چۆن شتەبەچاو واقیعییەکان دەبنە دەزووی**

چنینی ئاوەهـاش خەیـاڵ مەودای بیـرکـردنـەو چۆنییـەتی جوانکـارییـەکـە فرەوان و رێکتردەکات. خەیاڵ و وێنەی نێو شیعـر وشـەو موفـرەداتـە ڕووت و قوتـەکـان پۆشتـەوەکـات و گیاندارانەش دەیانهێنێتە سەر تەختەی شیعر.

شەکسپیـر لە شانـۆنـامـەی (خـەونی شەوی هاوین)دا شێت و عاشق و شاعیـر دەخـاتـە نیـو قالبێـك و هەرسێکیان مەحکومی خەیاڵ دەکات.

**المجنون و العاشق و الشاعر**

**يمتلئون جميعاً بالخيال**

**فعين الشاعر اذتدور في هياج جميل**

**تنقل الطرف من السماء الى الارض، ومن الارض الى السماء. «2»**

شیـعـر لەڕوانـگـەی مانـاگـشتییـەکـەی هونـەری بەنـدییـەکیـەتی بابەت و دێروکێش و سەروایە.. ئەوانەش بیـرۆکـەی شاعیـر تەنگـەنـەفـەس دەکـەن و دەبنـە کۆت و مەحـەك و دەخـرێنـە گەردەنی شیعر.. لەوەوە بوارە تەختەی شیعـر لە چاو بابـەتـە ئەدەبی یـەکـانی تـر بەرتـەسکتـرو پیشووکورترە.. لەبەرئەمانەو پەرەسەندن و بەرەوپێش چوونی ژیـان و فرەوان بوونی ئاسـۆی بیـرکردنەوەی مرۆڤ بووە کە پەخشانە شیعرو بابەتەکانیتر شیعر ئامێزی وەك شانۆگەری شیعریو شیعرە چیرۆك ئامێزەکان هاتوونەتە ئارا.

گەر لەم دەلاقـەیـەوەش سەیـری ئەو چەشنـە شیعـرانـە بکەین کە کاك ئەنوەر ناوی ناوە «شانۆگەری بۆ خوێندنەوە» دەگـەینـە ئەوەی بڵێین شیعـر دەرەقتی خەیـاڵ و خەیـاڵات و تێرامـانـە کەی شاعیـر نەهـاتـووەو نەیتوانیوە لە چوارچیوەی خۆی بگـرێ. ئەم تەرزە شیـعـریـیـەی کاك ئەنـوەر (شـانـۆگـەری بۆ خوێنـدنـەوە) درامـای شیعـرییـەو وەك لە پۆلێنکـردنی شانـۆو درامـا جیـاجیـاکـانـدا، ڕەخنـەگـرو لێکـۆڵـەرەوەکـان درامـای شیعـرییان ناولێناوەو وەك زاراوەش بیست و چوارەمین زاراوەی شانۆگەری درامییە.

درامـای شیعـری وەك زاراوەو بەکـارهێنـانی دوو تەرزە بابەتی شانۆگەری جیا دەگرێتە خۆی. یەکێکیان: ئەو شێوە شانـۆ گەرییـەیە کە نووسـراوە بۆ ئەوەی لەسـەر تەختـەی شانـۆدا بنـوێنـرێت. هەنـدێجـار ئەم زاراوەیـە ئەم شانـۆگـەرییـانـەش دەگـەینێ کە لە شێوەی پەخشـانـدا نووسراون. دووەمیان:

ئەو شانۆگەرییانەن کە زێتر بۆ خوێندنەوە دەشێن.

واتە ناتوانرێت وەك شانۆگەرییەکی ئاسایی دەربهێنرێت.

نەشیـاوی یا نەتـوانیـنـی دەرهێـنـانی ئەم چەشنـە شانۆگەرییانە وەك دەرهێنان ونواندنی شانۆگەرییەکی ئاسایی دەگەرێتەوە سەر هۆیەك کە زاڵ بوونی خەیاڵ و خەیالاتە بە سەر واقیـع و ویستی شانـۆگەرییەکی ئاسایی. بۆیە خوێنەر لە کاتی خوێندوەی ئەم شانۆگەرییانەدا دەتوانێ دیمەنەکان بەجـەستـە بکـات بەڵام دەرهێنـەر ئەو سەرکـەوتنـە بە دەست ناهێنێ کە دەقی شانـۆگـەرییـەکـە دەیـەوێت (شـانۆ بریتی بوو لە گریانی چەند ئێسکبەندی شتی نەزانراو..

کەس نەیدەزانی سەرۆکی دادگانێر بوو یامێ.. تاوانبار تەنهـا سێبـەری دیـاربوو. هەندێ جار لە پەرداخێکی بەتاڵ دەچوو هەندێ جار لە پشیلەیێ دەچوو هەندێ جاریش لە سوارێکی بریـنـداری دەکـرد.. ئـەنجام دادگـابـر یاری دراندنی نەخشەی گوندێکیدا) ئەوەیان چەند دیمەنێکی نێو شانۆگەری (دارێکی بێ پەلك)ی کاك ئەنوەر بووە باران و سروشت:

زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی کاك ئەنوەر لە ئامێزی سروشت و بەکـاریگـەرێتی ڕواڵـەتەکانی لەدایك بوونە.. ئەوەیان لەبەرئەوەی شاعیر خۆی لە نێو ئامێزی سروشت دا یەو ڕوالەتەکانیشی بوونەتە هایەی کارتێکردنە سەر هەستی ڕەنگدانەوەیان لە شیعردا کارێکی ئاسایی یە بۆ شیعرو شاعیر.. بـەڵام نەك لاسـایی کردنـەوەو تەنیـا وەسفکردن بێت.. چونکـە لە حاڵـەتـی ئەوهـادا دەوری شاعیـر تەنیـا لە وێنەگرێکی فۆتوگرافی دەکات و هیچیتر نا...

شاعیران لەروانگەی رەمزو دەلالەتەوە سەیری باران، با بەفر، رووبار ،زریان و. . . دەکەن و لەوساتەی دەبنەمایەی لەدایك بوونی شیعرێکی بەرزو قەسیدەیەکی نەمر شاعیر وا هەست دەکات جوانیو دەست رەنگینی خۆی لە جوانیو رازاوەی سروشت بالاترە. . لە کۆنی کۆنە مرۆڤ لە سروشت ترساوەو دیاردە کانی مرۆڤەکەیان چاوترس کردوە ئەوەشیان وێرای ئەو هێزە پەنگ خواردووەی سروشت هەی بووە باو باران و زریان چۆن بوونەتە مایەی خێرو بێرو بەپیت بوونی زەوی دیوی دووەمیان مایەی زیان و کارەسات و وێران کردن بووە. . .

باران رەمزی بە پیت بوونی زەویو مایەی خێروبێرە بۆ مرۆڤ. .

ئەمە رەمزە ئاسایی‌یەکەی بارانەو لە شیعری شاعیرانیش بەر چاودەکەوێت. . بەڵام کاتێ باران دەبێتە مایەی لافاو وێران کردن و تێك دان هەڵبەت ئەم رەمزەی نابێ وەك جاری یەکەم هەیبووە. . کاك ئەنوەریش بەپێی ئەو دەستەڵاتە شیعرییەی کە هەیەتی لە هەندێ شیعریدا بارانی لە رەمزە ئاسایی‌یەکەی خۆی دەرهێناوەو رەمزو دەلالەتێکی تری داوەتێ. وەنەبێ ئەنوەر یەکەم شاعیر بێت رەمزی وێران کردن و رووداو بەباران ببەخشێ، بەڵکو پێش لای نەوزاد رەفعەتی شاعیریش سروشت و روالەتەکانی لە رەمزە ئاسایی یەکەی خۆیان هاتوونەتەدەر ،من ناڵێم ئەنوەر لە سەداسەد لەم شیعرانەیدا لە ژێر کارگەرێتی نەوزاد دایە، بەڵام جێ پەنجەو کەش و هەوای شیعری نەوزاد لە هەندێ شیعری ئەنوەر بەرچاودەکەون (بەدرێژی لە لێکۆڵینەوەیەکی تر لەم لایەنە دواوم). باران ی نێو شیعرەکانی جارێکی‌تر خۆریان بە چەند وشەیەك دەناسرێنەوە کە [بارانێ لە زەردەواڵەی هاردەچن. . بارانێکن سەربەقەپوچکەن. . بارانێکی نەشارەزان. . . ]

ئێواران بارانێ دێتەخوار
دڵۆپەکانی وەك زەردەواڵەی هارن . . (ل ـ 26 ـ)

دانی سیفەت و خاسییەت بە باران وەك [زەردەواڵە، سەربە قەپوچکە، نەشارەزا. . ] کاری راستەوخۆی بە شیعرەکان بەخشیوەو شیعرەکانی لە شیعری دروشم و تەنانەت راپۆرتکاریش نیزیك کردۆتەوە. . کاك ئەنوەر دەیتوانی خۆی تووشی ئەو راستەو خۆی بەودرو شم کاری‌یە نەکات گەر وشەکانی [سەر بە قەپوچکە، نەشارەزا، زەردەواڵە. . ]ی بەباران نە لکاندبا ،بەڵکو بەبێ‌بوونی ئەو وشانە مەبەستەکەی لە نێو شیعرەکاندا چڕبکردبایەوە. . ئەوسا سەرکەوتنیکی گەورە بۆ کاك ئەنوەر تۆماردەکراو شیعرە چڕو پڕماناکانیش
مەزنتر دەهاتنە بەرچاو

زمانی نێو جارێکی‌تر خۆربان:

زمان ئێسقان بەندی نێو پەیکەری شیعرە زیندوی هەمیشە ژیاوی شیعریش کارێکە چۆن لەسەر ئەداتەکانی تری شاعیر وەستاوە ئاوەهاش زمان رۆڵە سەرەکی‌یەکەی خۆی تیا دەبینێ.

شاعیر بە زمان دێتە گۆو بەزمانیش روحی شیعر پێشاندەدات.

بۆیە ئەوانەی لەم گۆشە نیگایەوە چاو دەبڕنە زمان ئەرکێکی مەزن و ناسکیان دەکەوێتە ئەستۆ کە بە قەد ئەرکی رێزمان نووسێکە لەگەڵ مێژووی زمان و مۆسیقاو فۆنەتی وشە سەودا دەکات خۆ زۆر جاریش سەودای شاعیر ناسکترو بەر پرسیارترە لە سەودای رێزمان نووسەکە.

جیاوازی نێوان شاعیری هونەرمەندو شاعیری میللی جگە لە چەند جیاوازییەکی تێروانینی شیعرو رۆشنبیرین جیاوازییە هەرە گەورەکەیان لە چۆنییەتی مامەلەکردنیانە لەگەڵ زمانیو زمانی دەربڕینی شیعرییان .شاعیری میللی رستەو دەستە واژەو موفرەدات و

وشەی گۆڤەری واتە لەهجەی مەحەلی بەکاردێنێ . . تاقە هۆیەکیش لەمەبەستی ئەم بەکارهێنانە بۆ ئەوەیە تا خەڵکی رەش و رووت و نەخوێنەوارو نیمچە خوێنەوار لە شیعرو

مەبەستی شیعریان تێبگات..

بەڵام لای شاعیرێ هونەرمەند زمانی شیعر زمانێکی ئەدەبی زیندووی هاوچاخی بەر گۆران کەوتووەو خۆدوورکردنەوەیە لە وشەو موفرەداتە گۆڤەرییەکان.

لەهەندێ شیعری جارێکیتر خۆربارانـدا لەرادەر رووبەرووی هەندێ وشەو دەستەواژەی گۆڤەری دەبینەوە کە تەنیا لە ناوچەیەکی تەسك بەکاردێن و بەرامبەریشیان لە زمانە ئەدەبییەکەدا هەن.

راستە زۆرجار شاعیر چەند وشەیەکی ناوچەیەك بەکاردێنێ کە بەکارهێنانی پێویستی هونەری دەربڕینی شیعر داوای دەکات.. بەڵام ئەوەندەی من سەرم لێدەربچێ وا تێدەگەم پێویستی هونەری شیعر وای لە کاك ئەنوەر نەخواستووە لە جیاتی [زیندو، ببێتە، ووتن و....] وشەی [زیندی ،ببتە، گۆتن...] بەکاربهێنێ. زۆر وشە هەن بۆ شیعر گرانن و تەنانەت ئیقاعێکیسەنتێش بە شیعرەکە دەدەن.

بۆ نموونە وشەی - گۆتن - هەر لە فۆنەتیك و پێکهاتنەکەیدا دیارە کە بۆ شیعر گرانەو مۆسیقاکەی دەنگێکی گڕی قورس دارە بەڵام - ووتن - زێتر شیعری ترەو مۆسیقاو ئیقاعێکی خۆش و روح سووکە.

شاعیری لێهاتوو دەست ڕەنگین بیرۆکەی شیعرێك کە سەر بەکەش و شوێن و کات و رووداوێکە لە دەستەواژەیەك دا دەیچنێ و شیعرێکی پێدێنێتەئارا..

کەچی شاعیر واش هەیە ناهێڵێ شیعرێك بەتەواوەتی لەدایك بێت و دەینووسێ.. جا دووبارە بوونەوەی دەستەواژەیەك و مەفهومێك لە چەند شیعری جیاجیادا وێرای ئەوەی غەدر کردنە لە شیعر بێئاگای وەیا پەلەکردنی شاعیریش نیشان دەدات..

لە هەندێ شیعری کاك ئەنوەردا ئەم دیاردەیە واتە دیاردەی دووبارەو سێ بارەبوونەوەی دەستەواژەو مەفهومێك بەزەقی دیارە هەر بۆنموونەلە شیعری (سەرم خاکێکی بێولاتە) دا دەڵێ (سەرم پڕی هەوری بەفرو هەوری باران و تەزرەیە).. لە شیعری (کارەسات)دا دەڵێ (سەرم پڕی شی کردنەوەو کۆکردنەوەو دابەش کردنە) لە شیعری (داوەتی مانگی گوندەکەم)دا دەڵێ (سەرم پڕی مەلی سڕوپڕی گوندو پڕی خراپگەو شەوبایە) تاسەری نێو شیعرە کە دەبێتە (سەری من پڕی دەراوو قەڵاو شارە). هەروەها دەستە واژەی (لە من بپرسن) بەم شێوانە دووبارەو سێ بارەبۆتەوە لە شیعری (تا)دا دەڵێ (لە من بپرسن کەی خۆر لە تاراوگەکان ئاوارەبێ) دیسان دەڵێ (لە من بپرسن شێتەکان خەو بەچ شەوێ دەبینن). لەشیعری (تارمایی گۆرانییان دەڵێ)یش دا واهاتووە (لە من بپرسن گیاکەی کژی دێ لە ناو بەردان بێتە دەرێ) دیسان دەڵێ (لەمن پرسیار بکەن مردووەکان حەز لەکامە گۆرانی دەکەن؟) ئەمانەو دووبارە و سێبارە بوونەوەی (- با - م لێ بدات)و (خۆم بەخۆڵ دەشۆم)یش بەهەمان کارەساتی جوینەوە هاتوون.

مەزنێتی شیعر:

کاتێ ژان کۆ کتۆ لەمەزنێتی شیعر دەدوێ دەڵێ (شیعر پێویستییەکە خۆزگە دەمزانی بۆ؟) هەڵبەت مەزنێتیو پیرۆزی شیعرە ژان کۆکتۆی سەرسام و نیگەران کردوە بۆیە هەموو گرنگیو پێویستی ئەم هونەری بە (خۆزگە دەمزانی بۆ؟) دەربڕیوە..

بەڵێ شیعر مەزن و پیرۆزەو ناتوانین لە قاڵبی بدەین و پێناسەیەکی بدەینێ چونکە کەوامان کرد ئەوا بۆ سات و اعتباراتێك شیعرەکە بچووك دەکەینەوە.. لەلای ئەنوەری شاعیریش شیعر مەزن و پیرۆزدەبێ.. لەوساتانەی ژانە شیعر دەیگرێ - ئەو - واتە - بیری - لێدەبێتە دڵ و کوردستانیش سەریو...

**کەژانە شیعر دەیگرتم**
**تۆ دڵم بووی**
**مرۆڤایەتی قاچم بوو**
**کوردستانیش دە بووە سەرم (ل - 16)**

بەرلەوەی شاعیر ژانە شیعرەکە بیگرێ.. مرۆڤێکی ئاسایییە وەك هەموو بوونە وەرێکە بەڵام ساتی ژانە

شیعرەکە چوونە نێو خەلوەت و لێ‌خوردبوونەوەی تیایە . . ئەو شتانەی لەساتی لێ خوردبوونەوە دەبنەمە لوتکەی ژانەکە بەر زەبرە مەزن و پیرۆزەکەی شیعر دەکون و پیرۆزو مەزن دەبن بۆیە ئەو گۆرانەی شیعر دەیخاتە سەر شتەکان گۆرانێکی مەزنەو شتەکانیشی لە قالبە سادەی‌و ساکارەکەی خۆیان دێنە دەرو بەهادارو پیرۆز دەبن .

**ئەو ئاوەی ئێواران شیعرت فرێ دەدایە ناوێ**
**پاشی تۆ بووە تەیر**
**ئەو بەردەی ئێواران شیعرت لە سەر دەگوت**
**پاشی تۆ بووە درەخت . (ل ـ 42 ـ)**

ئەم شیعرە (بۆ بێکەسی) شاعیرو شۆرشگێرە هەر (بۆ بێکەس)یشی ناوە . . ئەنوەر وەك شاعیرێك و وەك مرۆڤێکی کورد لە بێکەسی شاعیرو مرۆڤ تێدەگات و دەزانێ چەکە شیعرییەکەی بەرووی دوژمنان لەکاربووە بۆیە بوونی بەرد بە درەخت بە هۆی خوێندنەوەی شیعر لەسەریا پەیدابوونی ئەو گۆران کارییەیەکە بێکەس لە شیعرەکانی‌دا بۆی دەسووتا ئەوەیان وێرای ئەوەی بوونی بەرد بە درەخت گیان دانە بە بێ‌گیان و مردوێك . . گواستنەوەی گیانیش لە شیعرەکەوە بۆ بەرد بەشێوەی ـ التناسخ الرواح ـ دەبێ .[5]

شایەنی سەرنج دانیشە شاعیر لەم شیعرەی‌دا دوو وێنە شیعری زۆر جوانی لە بۆتەی یەکیەتی بابەتەوە تواندۆتەوە بێ‌ئەوەی بە (و)ی عەتف و ئامرازی پەیوەندی لێکیان گرێ بدات . ئەم چەشنە [illegible]کردنەش سیفەتێکی بالای شاعیر دەنوێنێ دواسەرنجی ئەم نووسینەمان دەخەینە سەر شیعری (بێری نامە)و دەلێین لەم شیعرەدا بەرزێتی‌و پیرۆزییەکە تەنیا لەکاتی (کاری بوون)ی رابووردوە نەك لە هەمووکاتەکان . . خۆ دەکرا شاعیر (بوون)ە رابوردووەکە بکاتە (کاری بوون)ی هەمیشەی و بەرگێکی نەمری بەربەرەوە بکات . . مادام شاعیر لەهەر سێ کاتەکان رابوردوو . . ئێستا . . داهاتوو، ژانە شیعر بیگرێ یا بە واتایەکی‌تر ژانە شیعر کارێکی هەبووی هەمیشەی شاعیر بێ مەزنێتیەکەش تایبەت مەند نابێ بۆ کاتێك لە کاتەکان . .

بۆیە گەر لای ئەنوەر مەسیفی (کاری بوون)ە رابوردووەکە بەم جۆرە بگۆرابوایە :

**که ژانە شیعر دەمگرێ**
**تۆدلمی**
**مرۆڤایەتی قاچمە**
**کوردستانیش سەرم**

ئەوا (بیری، مرۆڤایەتی، کوردستان،) دەبوونە سیفەت و دەلالەتێکی هەمیشەی نەك تایبەت مەند بۆ دوێنێ‌و رابوردوو . .

دواجار هەر بەم قسەیەی کاك ئەنوەر کۆتایی بەم نووسینە دێنم کە لەسەرەتای دیوانەکەی نووسیوویەتی (بەخودا چوونەوە زۆرجار هەلەکاری کەم دەکاتەوە . دەبا بە خۆمان دا بچینەوە هەر هیچ نەبێ بەشکەم لەدەرگای شاعیرانی داهێنەر (بدەین) .

**سەرچاوەو پەراوێزەکان**


1 ـ **گۆڤاری بەیان ژمارە ـ 67 ـ ی کانوونی یەکەم 1980 .**

2 ـ **التصور والخيال ،تألیف ر. ل. بریت ترجمة د. عبدالواحد لؤلؤه ص ـ 13 ـ 18 ـ بغداد 1979 .**

3 ـ **هونەرە جوانەکان زنجیرەی ـ 5 ـ لەبلاوکراوەکانی کۆمەلەی هونەرە جوانەکانی کورد ل 12 ـ سلێمانی چاپخانەی نەورەس .**

4 ـ **هاودەنگ . بەرگی دووەم بەغدا چاپخانەی الحوادث**

5 ـ **موسوعة علم النفس اعداد د. اسعد رزوق. ص. 9 . المؤسسة العربية للدراسات والنشر بيروت. 1977 .**

6 ـ **جارێکی‌تر خورباران شیعر، ئەنوەر مەسیفی . . بەغدا چاپخانەی شفیق 1984 .**

# لەزێ نەکەن پێداچوونەك رەخنەیی یە ل سەر هوزانا گەنجێن ئەڤرو ...

رمضان عیسی

ب راستی ژ بەری دەمەکێ م دڤیا هری یا ڤی بابەتی ب رێسم ،لێ دەهر بزاڤەکێ دا من خوه پاشڤە د کشاند و د هێلا بوێڤە تر، ل سەر وێ هزرێ کو بەلکو ئێکێ دەست هەل ترو شەهرەزاتر ڤێ بەلایێ ژ من ب ڤەگوهێزە، چونکە یا وەلێ هاتی مینا گلولکەکا ئالزی مروڤ نکاریت بسەرێ بەندکی بکەڤیت، دا کو ڤەکەت و ب تەشیا خوه ڤە گرێدەت ئو ڤرا لێ ب دەت هەتا کو دار د بنێ را هاتی برین ئێدی من دایەخ نەما، ژ ڤێ چەندێ را ژی رێکەفتەك ژ من را پەیدا بو دەمێ من د روژەکێ دا مینا هەر روژ رێیا خوه د کتێبخانێ ئێختی د گەل برادەرەکێ خوه، د وێ دەلیڤێ دا گوڤارەك عەرەبی یا عیراقی شنی گەها بو،م ژی دەست ئاڤێتێ بەر پەرێد ئێکێ وەرگێران، ئێغبالێ رویێ ژ ناڤدا یێ بەرگێ دوماهیێ سینگێ خوه ژ مرا ڤەکرو م هند دیت کو کابرایەکێ کاریکاتێر د ناڤدایە وێ شەپلی یە و دڤێریت: [ب خودێ گیرمانە . . چ بکەم . . چ نەکەم، نزانم دڤنا خوه ب خورینم، جغارەکێ ب کێشینم، رابم قاوەکێ ڤەخوەم ،یان ژی (موسەلسەلەکا ئێزاعی) دانم !!. . ئەڤی وێنەیی تشتەك د سەرێ م دا غولغولاند و هەر بو توخێنا من و من هەر سەرێ خوه هژاند . . !!. هەڤالێ من ب نك م ڤە هات و گوت ها کەك و تە خێرە؟ من گوتێ ها بنێرە، ئەڤی یا پەقاندی !!- دەمێ وی ژی تێ نێری بەردا کەنیێ و گوت، ڤێجا تە شولە ژێ یە هو تو کەتی خرك و گومانێ ،من گوتێ من شولە ژێ نینە و ئەز نە بو وی یێ هێرسانم، لێ هەر ئێك بو مری یێ خوه د کەت گری.

ئینا گوتە من: «مریێ تە کیە؟» من گوتێ :هوزانڤانێد مە یێد گەنجن، گوت باوەر بکە تو راست د بێژی. .

ڤەهاندنا هوزانا د ڤان هەیاما دا ژ جغارە کێشانێ و قاوە ڤەخوارنێ ب ساناهی تر وا لێ هاتی، هێشکو باشە ڤی کابرایی دهولا دانەرێد زنجیرێد ئێزگەهیێ یا ڤوتای، لێ خوەزی ئێکی جارەکێ ژ ناڤ مە ژی یێ ل جورعەتا خوه دانا با و پیچەکێ ل دهولا یێد مە ژی دابا . . ئەڤێ سوحبەتێ مینا هەڤیری ئاڤ ڤەخوار. . ئێدی ئەز پتر گەرم بوم و حەویانا ل چ درا نە هات و هەر دا بێژم :باشە ئەوی کابرایی شیا ب چەند پەیڤەکێن لێبوکی بابەتەکێ گرنگە بدەتە بەر چەرخا رەخنێ و پیڤانا [illegible]ەرێد زنجیرا سور بکەت، ئو ئەز ڤان هزرا هەر داد دلێ خوه دا ئاڤاکەم و هەرێفم ،کا ئەز دێ چەوا رێکەکێ ڤەوژێرم کو بشێم تشتەکێ هوسا بنڤیسم، لێ ب باشترین بەرهەم و ب کێم ترین زیان، یانکو بشێم مایێ خوه د سەروبەرێ هوزانا مە یا شەپرزە دا بکەم، دا کو وجەکا سەرکز بگەهینمە تورێ خوه ودیسا ژی بگەهینمە خوەشتڤێد خوه یێد هوزانڤان،

بێی کو ئێك ژ وانا ب عنریت و مەبەستا من بدرستی نە وەرگریت هەر د ڤان کاودانا دا ژ ی گەلەك جاران من دیسا خوە ڤەدکێشا ژ ڤێ پێ رابونێ و داد دلێ خوە دا بێژم: یا ژخوەیە د ڤی زەمانی دا، کەس گوهێ خوە نا دەتە کەسێ و کەس ژی خوە نا دەتــە ب کەسێ و راستـی یا کولاڤ خارە . . لێ پا ل دوماهیێ گوتنا مەزنا خوە ل سەرێ من دا دەمێ د بێژیت: (باشیێ بکە و بەردە ئاڤێ دا).

دا رێ و هاژوت. ل ڤێـدەرێ من ژ تەڤ برادەران د ڤێت وەسا تێنەگەهن کو مەراما من ژ ڤێ گوتارێ ئەوە ئەز وان کێم دانم یان ژی ژ بزاڤ و گەرم و گوریا وان بینمە خار، بتنێ م د ڤێت ئەز پیچەك ژ روناهیا ئاگەهیا خوە و سەربورێ خوە د گەل هوزانێ و روژنامەگەرێ بەردەمە سەر وان ڤولاچێن تاری ژ بزاڤێد کو پێ را د بن،دا کو ب هەڤرا مل بدەینــە هەڤ و ب پر هێــزاتی بکــەڤینە رەخ کاروانێ هوزانـا کوردی یا راست و رەسـەن ،ئـو مەزن ژی د بێـژ ن :(هەر سەرەك ئاقلەکە). هوزانڤان کیە و هوزانڤانەتی چیە؟

ل بەراهیێ پێتڤی یە ئەم هەمی بینین هزرا خوە و دانین پێش چاڤێن خوە کو ئەو هوزانڤانێ ب سەر پەیسکا هوزانێ کەتبیت و گەهشت بیتــە سەرێ منـارا هوزانڤـانـەتیێ، بێ خش ئەو یێ بویــە سەرکێــشــەکێ پێش کێش و هەژی و مەزن و بێ بەڤـل بو کاروانـێ هوزانـێ، بەلکــو یێ تور و رەوشەبنیریا کومەلا جیهانی ژی. . یا نکو ئەو شاعرێ ببیتە دەنگەکێ ب هێز و ڤەدەر و کار تێکەر، دەنگێ وی نم دێ دەنـگ ڤەدەت ل تەڤ کوچـك و دیــوانخـانێـد ئەدەبی و رەوشەنبیریێ، ئو ل دەرێ روژنامەگەریێ دێ یێ دور بر - بیتن . . هەلبەت خودان بخوە ژی (هوزانڤان) دێ بیتە مروڤەکێ ب ناڤ و دەنگە و خودان سەنگە د هەمی جڤاتێد کومەلی دا و پەیڤێد وی دێ بنە رێچوون و بریارێد جێگیر بەرڤ ئارمانجێد مللەتی . . ئەڤ پێ نیاسینا من خوەیا کری بتنێ ژ بو سەرەدانا هش و بیدایە، چونکە نە تشتەکێ نویە من خوەیا کری، یان ئێکێ دی تر، بەلکو لە ژمێژ وەرە، ژ بەری چەنـد چەرخــا نڤیســەرێـد مەزن ،ســەر کێشێـد خوینــدنگــەهێــد ئەدەبی ل جیهـانێ، بەحسێ هوزانێ و هوزانڤــانــەتیێ وێـد کرین، هەر وەکـو مە د ناڤ پەرتوکا دا خوینــدی کو هوزانڤــان د بەرێ دا هەمی تشت بو د ناڤ کورەکێـد کومـەلێ دا. . بەحس بەحسێ وی بو، هەتـا کو دەم بو دەمی. . بەرڤ هێرڤە دەورێ وی ل کێمێ دای، ئو ئەگەرێد هندێ ژی د ئاشکەرانە، کو ئێك ژ ئەنجامێد وێ ئەو بو . . . بەرێ تورەڤانێد جیهانی، ژ هوزانێ ڤەکوهزتیە سەمتـا چیـروکێ و رومـانێ و شانـوگـەریێ ،هەلبەت ئەڤ ئاوایێ ڤەگوهازتنێ ژی پتر یێ بجهـ هاتی ل کومەلێن پتر پێشکـەتی د لایێن زانیـاریێ و پێشـەسـازیێ و شارستانەتیێ دا. مە چ ژ ڤێ چەنــدێ ژی نینــە و ئەم گەلــەك ل پەی ناچین ،هــەمـا دێ ژێ چەپـدەین و قەستـا بابەتێ خوە یێ سەرەکـی کەیـن و دێ ڤەکــولین و لێ گەرین کا جارێ ئەو هوزانڤــانێ وەســا مە ژێ بەحس کری چاوا وەلێ هاتیـە؟ ئەڤ پسیارە نهە بو تەوەرێ شەرەنیخا مە. هەکە هات و ئەم سەر بەرسـڤێ هلبــوین، هەلبــەت ئەڤ ئاگــرە دێ زوی ڤەمریت و هەر ئێك ژ مە دێ ل خوە زڤریت و جارەکا دی دێ کەڤیتە دان و ستاندنێ د گەل خوە و دێ هوزانێد خوە سەرك و بنك کەتە ڤە و دێ دوبر نێریتە وی هوزانڤانی و کەڤــیتــە دەوســا وی و دێ سەربــورەکێ نوی ژ خوەرا وەرگریت و دێ پێ خنێ بیت.

لێ. بەرسڤا ڤێ پسیارا گرنگ وە دیارە هەتا نهە ل بەر مە یا هندایە، یان ژی ئەم خوە پێ نا ئینین دەرێ .چونکە د (مــوریــێ)را یا دیــارە کو هەر ئێــك ژ مە د بزاڤ هوزانڤانەتیێ دا تەڤرێ خوە ل جهەکی د دەت.

ب دارشتەکێ سادە تر دێ ئاشکەرا کەین و بێژین:

هەکـە ڤێگـاڤێ بهێ و د ناڤ هوزانڤـانـا دا ل بەرسڤێ بگەری، دێ بینی کو هەر ئێك ب دویف دلێ خوە و ب هەتەری و مەزناهی دێ بێژیت ئەز د زانم و ژ وێ پێڤە تر نینە !!

ئێك دێ بێژیت: ژ بەر هژمارا دیوانێد وی یە! یێ دی

دێ بێژیت ژ بەر هەلبەستێد وی یێد بەلاڤکرینە ل روژنامە و گوڤارا. ! ئێکێ دی دێ بێژیت دەنگێ وی گەلەکێ خوەشەد میهرەجانا دا لەوا خەلك ژی حەژێ د کەن و دەستا بۆ د قوتن. . ! کابرایەکێ دی دێ بێژیت چەشنێ ڤەهاندنا وی یێ سڤك و سادەیە خەلك خر زوی تێدگەهن، ئێك ژی دێ خوە کەتە شێخ مەحمید و دێ بێژیت چونکە هزر و بیرێد وی د هو هو نە !!، چێد بیت ژی ئێك بێژیت هات و چوو. . رێکەفتەکا ژێرا هەلکەفتی و هەما یێ پێ سەرکەفتی . . ئو حەیا دوماهیێ ژ راڤێد لەنگ و ئێك تا یی . . یێد کو هەمی و هێژ پتر ژ بۆ بەرسڤدانا پسیارا مە د روژانە و هەر روژ ژی گەنجێد مە پاشە روژا خوە تێدا د سوژن . . ئەڤ بەرسڤە خر د وەنە لێ نە جودا و کت کت، بەلکو هەکە بهێین و هەمیا ل بەر بایێ رەسەنیا زانستی و ل سەر عەردێ ئاوایێ خوەیی ب هلاڤێژین و تەڤ بەردینە کوتەلا ئاشێ هوزانڤانەتیێ، هنگی دێ بینین تەڤ بەرسڤ وێ د نێڤ هەڤ دا هاتین هێران و زوردا ژ کوتەلێ هاتینە خار، دانەکێ پاك و بژین. . یان ژی ئەگەر رابین هژمارەکا هلبژارتی ژ هوزانڤانێد خوەیی و بیانی یێد وەسا کو گەهشتینە کوپەکێ بلند ژ کوپێد ئەدەبی بکێشینە مەیدانا ڤێ سوحبەتێ و تێر ل تەدارەکا وان بنێرین دیسا بێ گومان دێ گەهینە وێ قایلیێ یا کو د بێژیت، هەر هوزانڤانەك ژ ڤانا ب هژمارا دیوانێد خوە بتنێ وەلێ نە هاتیە، ئو نە ب میهرەجانا ب هژمارا هەلبەستێد خوە یێد بەلاڤکری بتنێ ژی، ودەست قوتانێ بتنێ ژی . . .ئو هەتا دوماهیێ لێ ب باوەریەکا موکوم و هزرەکا خزمەت پەروەر دێ زانین کو هوزانڤان ئەنجامێ دوماهیێ یە یێ کومەلەکا هەڤکێشا ل دەما کو هەمی پێکڤە هەڤکاریێ وکار تێکرنێ د هەڤدا د کەن ل نێڤ کێش و دەوسێن رەوشەنبیریەکا بەرفرەهـ و گشتی . . ئو هوزانڤانەتی ژی نە یا ب ساناهی یە کو هەر ئێك ژ مە چەند هەلبەستەکێد بێ سەروبەر لێکدەت و ل میهرەجانەکێ بخوینیت یان ژی ل دەرەکێ بەلاف بکەت ،ئو بێژیت

هەما هندە یا ئەز د زانم کەس نزانیت هەکە ئەم ڤێ چەندێ ژی ب رێچوونەکا کوردەواری ل سەر بئاخڤین دێ بێژین هوزان ڤەهاندن مینا ئاڤا کرنا کەپرێ یە، هەر توخمەك د هەڤکێشا (معادلە) پەیدا بونا هوزانڤانەتیێ د گەل هندەك توخمێد دی ژی یێد گرنگ و پر خلف و گرێ د بنە ستوینێد وێ کەپرێ ،ئەم هەمی د زانین چ کەپر ب ستوینەکێ بتنێ یان ژی ب دووا و سێ یا خوە نا گریت، ئەڤە هەکە ستوین بدرستی ستوین بن، هەکە نە ستوینێد وەسا ژی بن، بدەهان ژی چ کەپر خوە ل سەر نا گرن ،چونکو نە هەمی ستوین، ،ستوینن ستوینا هەی کاریتە و یا هەی تەرحە و یا هەی نیرە . . دیسان ستوینا هەی موکوم و یا هەی رزی و کەڤنار، ژ بلی هوستەڤانیا رانینا وێ و نژینا رەخ و رویێد وێ .ل سەر ڤی بنیاتی کەپرێد مە یێد هوزانێ بەهرا پتر د بێ ئاقوبەتن!.

چونکو هەر ئێك دەمێ کەپرەکێ ژ خوەرا چێدکەتن، هەمی پێتڤیێد وی ئامادە نا کەت و جهەکێ موکوم ژێرا دەست نیشان نا کەت، هەما گاڤا چاڤێ وی ب کەپرەکا خشکوك و لێکدای کەفت، دێ رابیت بلەز و بەز، ئێك سەرە دێ چیت بەزیتە تیانێ جوامێرەکی و هندەك تیرەکا ژێ کێشیت و بەتە وێڤەتر ،پیچەکێ بن ئاخ کەت ،پاشی دێ بەزیتە تیانەکێ دی و هندەك هەژا ژێ دەرینیت و بەت هاڤێتە سەر وان ستوینەکا و ترپ دێ ل بن پالدەت و پیەکی ل سەر پیەکی را هاڤێت و دێ بێژیت ما چ قوسویری ل کەپرا منە!! حال چ حالە سەرێ وی بتنێ دێ ل بن سیبەرێ بیت و کەلەخێ وی خر دێ ل بەر گەرما تاڤێ بیت. هەلبەت کەپرا هوسا چ قاس خوە نا گریت و چ بایێ رابیت ژی دێ تێ تشقلیت و پرتێد هەژا بەتە بەر عەسمانا.

ب راستی من هوسا ڤیا ئەز دەربرینا هزرێد خوە بکەم دەربارا ڤی سەروبەری، کو پەسنێد سادە و خومال ژێرا بینم، نە کو بچمە گوتن و هزر و رایێد نڤیسەرێد مەزن یێد بیانی ،چونکو یا خوەیا یە کو ئاوایێ مە یێ هەڤ چەرخ یێ ڤەمایە ژ وەرارا وانا ژ لایێ رەخنێ ڤە. لەوا هەکە من

وەکربا مەبەستامن دا یا پری مژموران بیت و ب ئارمانجێ نە د کەفت، ژ بلی هندێ ژی مەراما من نە ڤەکولینەکا رەخنـەیی یە ب شێـوەیـەکێ زانستی، بتنێ ژ بو ڤەکرنـا دەرگەهەکێ کلیل بەند کریە ل پێشیا مە گەنجێد ئەڤرو.

چونکـو د ڤان دەهـ سالێن دومـاهیێ دا کاروانێـد رێکا هوزانێ وێد بوش بوین و وێد ئێك دوو د هلنگفن و گەلەك ژێ هەسپێد وانا د سەتمن چونکو نە ل سەر رێیەکا دیاردە د هاژون. ئو هەکە بهێین و سەرو بەرێ خوە دانینە سەر بەرکێ و سەحکـەینێ کا هنـدەك ژ مە چ د کەن و چ نا کەن؟ . . دێ بینین هندەك چوار هوزانا د خوینن، دەها پێ د نڤیـسـن، ئو هنـدەك هەر ژ ڤان گاڤـا کرنـە بیـسـت (هـەلبـەست)تە هند دیت ب کەرێ ڤە برنە چاپێ بێ کو ئێکێ ژ خوە شەهـرەزاتـر پێ بحـەسینیت هەتـا کو چاپ د بیت و د کەڤیتە بازارێ، پاشی هنگی دێ هەر گوهێ خوە بەردەتە سەر دنیایێ کا چ بەحس و خەبەرێد دیوانا وێ هەنە!!

ئو هەر دێ هێت و چیت چێ دیت دێ ژێ پرسیت . . سـەیـدا، ئەرێ چ ئاقلێ تە ژ دیـوانـا من د بریت؟! . . . دیـوانـا چ برا . . ؟! بەلێ سەیـدا . . دیـوانا من فلان . . ما تە هێشتا نە دیتیە؟!

دەمێ د هێیی و سەح دکـەیـە (دیـوانێ) دێبینی کو (دنیایەکا دی یە!!) . . نە کێشت کێشە، نە قافیە قافیە یە، نە وێنێـد جوان هەنـە، نە روخسـار روخسـارە، نە مەعنـا مەعنـایـە، ئو هەکـە هنـدی سەرێ دەرزیکێ ژی گازندێ ژێ بکـەی، یان ژی کێمـاسیێـد وی خوەیـا بکـەی دێ عنـریت و خوە ژ تە غەیـدینیت و بێـژیت، چمـا سەیدا تو وەدبێـژی دیـارە تە باش خوانـدیـە، ما چ قوسـویری ل دیوانا من هەیە؟!.

هەکە بهێی و دان و ستاندنێ د گەل بکەی و بێژیێ: برادەر، بەهرا پتر ژ هوزانێد تە د بێ کێشن، دێ بێژیت: هوزانا ئازا یا هوسایە!!. هەکە بێژیێ :پا کا قافیێد ڤان هەلبەستێد هەنێ؟ دێ ب شالوزی و بێمنەت بێژیت: ها . . ها ئەڤە خر قافیەنە، فەرمو بنێرە: شەکر ،چێکر ،راکر، هوگـر، لەشکـر، پا ئەڤ (کـر) هەمـی چنـە، قەی نە قافیەنە!!! باشە هەکە هات و قافی ژی بن، ما چێدبیت د هوزانـا ئازادا خر مالـك بقـافی بن؟!. ئو هەکـە هێش ل دویف بچی و بێژیێ:

تو ل دەوسا کیش خویندنگەها هوزانی د چی؟ . . ئێك سەرە دێ بەرسڤێ دەت: (الـرمـزیـە) یان (الـواقعیـە) یان (!)، هەکـە بێـژیێ ژی: کیش هوزانڤـانی پتـر کار د هوزانێـد تەدا کریـە؟ دێ مەزن چیتێ و بێـژیت: خانی و جزیری و محمود درویش و دستوفسکی و بیکاسو بیتهوڤن ئەگەر بێژیێ ب هزرا تە کینە ئەڤرو دەنگێد شعری یێد ب هێز د ناڤ هوزانا کوردی یا هەڤ چەرخ دا ،دێ بێژیت: فلان و بێڤـان و بێ سێ یێ ژی هەکـە بێـژم، دێ بێـژن مەدحێد خوە د کەت!!

یانکو دێ خوە ژی دانیت دەنگەکێ ب هێز چونکو بویە خودان دیـوان . . ! ئەڤ کابـرایێ هوسـا مەتـەلا وی مینا یا خەزالێ و بەقێ یە . . .د بێژن روژەکێ ،خەزالەك بریندار بو . . چـوو قەستـا ئاڤـەکێ کر، داکـو ئاڤێ ڤەخوت، چەوا وێ دەڤێ خوە گەهاندە ئاڤێ . . بەقەکێ خوە ل بەر دەڤی هلاڤـێـت و گوت: ها خەزال تە خێـرە . . تـو و ڤێـرە . . خـەزالـێ بەرسف لێ ڤەگێـرا و گوت: قەی تو نا بینی ،ئەزا بریندارم، بەقێ گوتێ چنینە کەکو سلامەتی بیت، ئەڤـە هەر مە یا دیـتـی، حالـێ مە کێـڤـیـا هەر ئەڤـەیـە. !!!. . ژ بلی هنـدێ ژی هەکـە پسیارا مانـا رستەکێ ژێ بکەی و ئەو بخوە ژی نە زانیت دێ بێژیت :(مانا یا د دلێ شاعری دا).

برادەرەکێ دی تە هنـد دیـت هاژ چ نینـە، هەمـا کەلا ڤێهـرسیێ لێـدا و رابـو چوو پارچـە هوزانەك ڤەهاند، ڤێجا وەکـو خو ،ئـو ئێـك سەرە هنـارتـە گوڤـارەکێ، بێ کو بهێلیت د بەرویکا وی دا گەرم ببیت، هەلبەت بەلاڤکرنا وێ بیتە (خبر کانَ) ئەڤجا دێ هەر هێت و چیت و بیتە پت پتا وی و دێ ل هەمی درا دکرینیت و بێژیت :بخودێ ئەڤە نە حالـە . . ! غەدرێ ل م د کن! ئەڤـان نەڤـێـت تورێ

(بەهدینی) وەرار ببیت !! هەتا کو ژێ بێ هیڤی د بیت، ئێدی دێ بێژیت: ئەز دێ بەندکێ خوە د گەل ڤێ گوڤارێ بچینم، ئو دێ رابیت هەلبەستا خوە، ڤەگوهێزتە سەر پەرەکێ دی، هەر ب وێ تەدارەکێ ڤە، ئودێ فرێکەتە گوڤارەکا دی تر، لێ ئەو ژی هەر دێ ب بوهایێ یا بەرێ چیت . . ئو هوسا هەر دێ نڤێسیت و ل روژنامە و گوڤارا رەشینیت هەتا کو هەمیا د جەربینیت ئێك ئێکە و بێ هیڤی دبیت.

ل دوماهیێ دێ بێژیت ،ئەڤ گوڤارە هەمی نەوێرن هوزانا من بەلاڤکەن چونکە هندی هند یا دژوارە!!! . .

یا باشتر ئەوە ئەژی وەکو فلانی بخوە هندەك هوزانێد دی ژی بڤەهینم و ببەمە چاپێ، سەد جارا بێ‌منەت ترە!!

ئەڤەیە کارێ هندەك ژ گەنجێد مە کوردا. . . . شوین وارێد جزیری و خانی و بێکەسی و گورانی و نالبەندی و جگەرخوینی ئەرێ بووچی ئەم دێ وەکەین . . بوو؟ بووچی دێ ژ سەنگا تورێ خوە کێم کەین ل ناڤ خەلکێ، ئەز وەسا تێ د گەهم کو ئەڤ بزاڤێد هوسا سەرداچوونە وزیانە بۆ گەنجینا مللەتێ مە، ئێکێ وەسا بلا وەبکەت یێ کو چ بنیاتێد دویروکی یێد موکوم نە بن کو پاشە روژا خوە ل سەر دانیت.

ما کێ هندی مە بنیاتێد موکوم و جێگیر یێد هوزانێ هەنە، ئو بنیاتێد نوی کری د هەر قوناغەکێ دا، ژ جزیری بگرە هەتا د گەهیە جگەرخوینی . هەتا کو ل قوناغێد دوماهیێ هوزانا کوردی گەهشتیە روخ کاروانێ هوزانا هەڤ چەرخا جیهانێ و زومەك ژێرا هاتی ب رەوش ئێخستن ل زوزانێد ئەدەبێ جیهانێ . لەوا ئەم گەلەك و گەلەك د گونەهکارین هەکە ئەم هوزانا کوردی بخوە بکەینە پێ ترانك و یاری و مزویلاهی و دەست قوتان.

ئێکجار د ڤێ قوناغێ دا، کو هوزان وا بویە هەڤرێیا لویلیێ ،پشتەڤانا مروڤاتیێ، پاریەك نان ژ برسیارا، کراس ژ رویسارا، روناهی ژ تاریێ را، بازەبەر ژ کاروانی را، هەیڤ هوزانا مە ل دویف ناڤێ خوە بیت و ل دوین سوزا خوە بمینیت ،هەر دەم بمینیت گەرم مینا گەرما فیشەکێ نانەکا گەرم و نەرم، کراسەکێ سور و زەر و کەسك و شین، روناهیەکا وەك زەنکلێ ،بازەبەرەکا موکوم، هەڤالەکا پر سەبر و ئارام، هەیڤەکا گەش دار، ئەڤەنە خەونێد هوزانڤانێد رەسەن و پەروەر ،یێد کو خوشیێ پێدبەن و شەهنازیێ پێدکەن. ئو هوزانا کوردی یا پێتڤی و داخوازکری، کچا نەخری یا ڤان خەونا یە ،لەورا مە نەڤێت ئەڤ کچە یا سەربەردای و هەل هەلی بیت، یا کرێت و بێ‌سەرویەر بیت، یا ئەزمان رەش بیت، هەر دەم مە د ڤێت یا تەرو نازك و خەملی بیت ،بتورە و ئاقل بیت، دەنگ ئازا بیت، عاشقەکا خودان سوز و باوەر بیت. . .

هەر چەندە ژی ل گەلەك جارا و د هەمی سەرویەرا دا مروڤ نکاریت وێ بێژیت یا د دلێ خوە دا و مروڤ نکاریت وێ بەلاڤکەت یا کو مروڤ دبێژیت ،دیسا روژنامەگەری ژی نکاریت وێ بەلاڤکەت یا کو مروڤ ژێرا د نڤێسیت، چونکە د هەمی قوناغێد ژیانێ دا و ل هەمی چەرخا و ل تەڤ لایێن جیهانێ ئەڤ رویدانە یا هەی و هوزانا کەفتیگرفتاری یا و کەفتی بەر کینا سەردەهانا و بەر دەڤێ جاویرێ، ئو د ڤێتن ئەم گوتنا هوزانڤانێ فەرەنسی یێ مەزن (فکتور هیجو)ی ژ بیر نەکەین دەمێ خویا د کەت «ئازادی یا ئەدەبی ،کچا ئازادی یا رامیاری یە» لێ نەمانا وێ ئەوە چ هوزانا نە هاتە بەلاڤکرن، ئەم رابین ئێکا لەنگ بڤەهینین ،دا کو بەلاڤ ببیت، ئو چ هوزان ژی بکوتەکی ناهێنە ڤەهاندن و چ هوزان ژی ب (وحی)یێ نابن، بتنێ هوزان دەربرینا هزر و بیرا و نەپەنیێد دلی یە د پەیدابونا دەمێد ڤالا و بێ قەرقەشە . . . ئو ژ بو نمونە دێ هوزانڤانێ بریتانی (الفرید تنیسون) ئینین یێ کو ل سالا 1892ز مری، ئەڤی هوزانڤانی داستانەکا هوزانێ ڤەهاند ژ شەش هزار مالکا هێشتا کو ژیێ وی دوانزدە سال، ئو پشتی دوو سالێن دی شانوگەریەکا هوزانی دانا . . لێ هەکە بهێیی و هەڤبەریا وی چاخی د گەل چاخێ مە بکەی، بێ گومان دێ جودایەکا بەرفرەهـ بینی د ناڤبەرا

هەردوویـان دا دەربـارا هوزان ڤەهـانـدنێ د گەلـەك لایێن سەرەکی و گرنگ دا . . . ئێك ژێ ئەوە کو دوی چاخی دا درێژاهیا هوزانێ مەرجەکێ پێتڤێ بو ژ سەرکەفتنا هوزانێ را . . .

ژ بەر هندێ ئەو مەرج نهە ژ مە نا گریت ژی و بارێ مە سڤك تر ژی وێ لی هاتی و هوزانا مە چێدبیت ب دوو سێ مالکا بتنێ ژی ببیتە هوزان و یا سەرکەفتی بیت ژی . . لێ دیسا مەرجەکێ ژێرا هەی ،ئەو ژی ئەوە کو دڤێتن ڤەجوینا بابەتەکێ سەرنجو بکەت و یا پر هێز و شیان بیت و پر تام بیت. ئەڤجا دێ بێژین هوزان نە ب کورتی و درێژیێ یە و نە ب کێم و گەلەکیێ یە . . بتنێ فلی (إبداع) ئەنـدازا وێ یە . . ئـو ئەڤ رویـدانـە د هوزانێ بتنێ دا نە پەیـدابـویـە، یان ژی د ئەدەبی دا، بەلکـو د هەمی کار و کریارێد ژیانێ دا . . چونکو سەردەمێ لەزێیە. لەوانهە ئەو هوزانا گەلەك درێژ بیت یا بێ تامە و بێ پاشەروژە، ئو ئەو کەسێ رابیت هوزانەکێ بڤەهینیت و پێنج شەش بەرپەرێد فولوسکاب پێ بگریت، ما هەکە ئەم وێ هوزانێ (یانکو هزر و وێنەیێد وێ هوزانێ)، پیچەکا دی تێ بخەبتیت و بکـەتـە چیـروك ،ئـەرێ ما چێتر نینە . . دگەل وێ چەندێ ژی را چیروك بخوە ژی هەرا کورت دبیت، یانکو چیروك ژی دایەخیا وان بەرپەرا خرا ناکەت . .

ئەڤە ژ لایەکی ڤە ،ژ لایەکێ دن ڤە . .گەلەك ژ ڤان برادەرێـد مە ژێ بەحس کری ،هـوزانێ د نڤێسن دا کو خزمەتێ بکەن، ئو د دلێ خوە دا د درستن ،لێ د ڤێت ئەم بزانین کو هەر خزمەتەکا هەبیت د ژیانێ دا د دلی بتنێ دا ناهێتـە بجهـ ئینـان ،چونکـە هنـدی خزمـەتـە، بزاڤ و پێکـول و وەستـانـدن د ڤێت، ئو خزمـەت کرنـا ب رێکـا هوزانێ . .نـە وەسـا یا بسـانـاهیـە مینـا ئەم تێ د گەهین . .کێشەکا دویر و درێژ و پر ئاستەنگە، ژ بلی وەستاندنێ ژی شەهـرەزایـەکـا بێ توخیب ژێـرا دڤێت، چ سستی و لاوازیا تێدا پەیدا ببیت دێ ل سەر حسێبا ئەدەبێ مللەتی خرێ بیت. . یانکـو دێ زیـانـەکـا نە داخواز کری گەهینتە تورێ مللەتی . .مینا هوستایەتیا ئاڤاهیا یە، ئەگەر هوستا نە یێ شەهـرەزابیـت ،چ ئاڤـاهیێ ئەو دانیت دێ پشتی هەیامەکێ ب سەرێ خودانا دا هلگومیت، د سەر هندێ را ژی شەهـرەزایـا پێتڤی بو ئەدەبی و ئێکجـار بو هوزانێ یا جودایە ژ هەمی شەهرەزاییێن دی دکار و کریارێد ژیانێ دا ،چونکو چ قالکێن ئەندازیێ ژێرا نینن، هەر وەسا بەرا پتر ژ ئاڤاهیێ ئەدەبی یا بن ئاخە . .یانکو ئەدەب چارەسەریا گرێك و لایێن ئاسێ و ڤەشارتی د ژیانێ دا د کەتن. . لێ ل سەر وان هێلێد نەپەنی، چەند خالەکێد گرنگ و پێتڤی وێـد هەین دڤێتن هەر هوزانڤـانـەکێ تازە دەست ب هاڤێتە فەهاندنێ ل دویف بچیت، دا کو بشێت د ڤێ رێدا ب راپـەریت و خوە بگـەهینتـە قونـاغـەکێ. . ئو هندەك ژ وان خالا ژی ئەڤێد ژێرینە:

خوێندنا بەردەوام بۆ تەڤ بابەتێن ئەدەبی، یێد کوردی و عەرەبی و بیانی، مینا هوزانا و چیروکێد کورت و رومانا و شانەگەریا وبابەتێن رەخنەیی.

**● خەندنـا کەك و بەردەوام بۆ چاپەمەنیێد کوردی، مینا گوڤارا و روژناما و پەرتوك و گوتارا.**

**● خویندن د ڤێت گەلەك و گەلەك پتر بیت ژ نڤیسینێ.**

**● ل پەی چوون و لێ گەریانەکا بەردەوام بۆ کەلەپور و فلکـولـورێ کوردی، چونکـو دویـروکـا مللەتی ئەوە، ئو زەنگین ترین گەنجینا زمانی و ڤەهاندنێ یە.**

**● خوە ژ دزینا وێنە و رێچوونێد هوزانێد خەلکی دویر بێخن، هەر وەسـا وێنێـد فلکـولـوری یێـد حازر و بزر نە داهێلنە د ناڤ هوزانێد خوە دا وەکو وان.**

**● هوزانـێ بو هەلکـەفتنـا بتنێ نە نڤیسن و خوینن، چونکو هەمی وینێد ژیانێ هەلکەفتنن ئو هەر مروڤەك ل جیهانێ هەلکەفتنەکە.**

**● هوزانـا هەوە بلا ل پەی دەوسـا سەرکێشێـد مە یێـد مەزن و پێشکەفتی نە دەرکەڤیت، دا بەرزە نەبیت.**

**● هوزانـا خوە ب لەز نە هنێـرنـە بەلاڤکـرنێ ،بـلا هەیـامـەکێ د هزر و ئاشـوپـا وە دا ب هێتـە کێتن و حەل**

کرن، دا کو پەشیمانی، بەلافکرنێ نەبن.

● هوزانـا خوە هەر دەم نیشـا هەڤـالا بدەن و ژێـرا بخوینن، دا کو هزر و رایێد خوە ل سەر لایێد خوگر و دارن تێدا دیار بکەن و وجێ ژێ وەرگرن.

● هەر ئێـک بلا هزر و رایێـد درست ل سەر هوزانا هەڤالێ خوە بدەت ژ دویری هەڤالینیێ و شەرمێ و پف دانێ.

● هەر هەولـەکـا هوین بدەن د چوارچـوڤێ ئەدەبی و هوزانێ دا، ژ بەری تشتـەکی و مەبـەستـەکێ بلا خزمەت کرن ئارمانجا هەوە بیت ژ بەری هەر هزرکرنەکێ

● ناڤ و پێناڤ کرنێد هەوە بلا نە هند د گران و درێژ و بکەلەخ بن، دا کو د بنڤە نە قریێن و نە فشیێن چونکو پاشەروژ ناڤ و پێناڤ کرنا مروڤی د دانیت.

● گەر د هوزانەکێ دا هوین د سەرکەتی بن، ئێدی زویکـا نەفـرن ،ئـەگـەر فرین ژی، بلنـد نەچن، گەر د کەڤن دا نەمرن.

● هزر و بیرێد هەوە د ئەدەبی دا، بلا د بەرفرەهـ بن و خوە نە ئێخنـە تەپکـا توخم پەرستیێ و ئیجـاخ ئیجـاخـانێ ،کـو هەر ئێـک خوە ب ناڤێ هوزا خوە ب ناڤ کەت و بدەت نیـاسین، چونکـو بنیـاتێ هوزایـەتیێ ل سەر حسێیا هیڤی و ئارمانجێد مە یێ دانایە.

ئەڤجا برایینو. هەکە هات و مە لکاندن ب ڤان خالا کر، بێ گومان دێ وجێ ژ خوەرا ژێ گرین د پێشکەفتنا خوە دا و دێ شێین ب شانازی خزمەتا تورێ مللەتی و مللەتـی بخـوە ژی کەیـن، یێ کو د ڤی دەمـی دا پتـر هەوجەیی ب هەول و بزاڤێد مە هەی.

ئو هیڤیا من حز ئەوە کو ئەز شیابم روناهیەك روهن و زەلال بگـەهـینـمـە ئەڤ هەڤگـورا. ئو ئەز یێ ل جهێ باوەریەکا موکوم کو بانگێ من دێ د گوهێد وان دا دەنگە ڤەدەت و بیتە رێچوون و رابەر د رێبازا وان دا و جارەکا دی دێ بێژم:

د ڤیـت ئەم لەزێ نەکـەیـن .. نێ یارێ لەزێ هەر پەشیمانە ....

# چەند پەندێن لەنگ.. ژ پەندێن پێشیان

* فوزی محمد گیادین *

فولکلۆرێ مەیێ ب بهاترە ژ هەموی خزینێن زێرا ئو یێ ب سەنگە ب هەموی لایێن خوڤە، لێ من دڤێت دڤێ دەرفەتێدا ل سەر پەندێن پێشینان ئانکو گۆتنێن مەزنا باخڤم چنکۆ ل دویڤ دیتنا من زۆر ژ پەندێن وان نە دجهێ خو دانە، نە خاسمە دڤی چاخیدا. چاخێ پێشڤە چوونێیە ل تەڤ جیهانێ و چاخێ پێشکەڤتنا تەکنۆلۆجیایە و بەرفرەهبوونا هزرێ، ژ بەر ڤێ چەندێ فەلسەفا وان یا کەڤن، هەموی نە دجهێ خو دایە، لێ هندەک پەند ژێ ددروستن ودێ مینن جهێ شانازی یامە بفەلسەفا باب و باب کالکێن مە.

1 ـ نموونە ژ پەندێن لەنگ:ـ

[هەیی بە کورێ صەیی بە ][1]. ژڤێ گۆتنێ دیار دبیتن تنێ چاڤێ وان یێ ل پەرا و هیچ بهای نا دەنە مرۆڤێن بژیرو تێگەهشتی ،بهایێ وان هەموی بمالێ جیهانێ رایە و ددویرن ژهەموی تۆرێ باش و رەوشتێن چاك.

بتایبەتی ئەڤ گۆتنە دهێتە گۆتن دەما مرۆڤەك دەولەمەند بچیت ژنەکێ بخوازیت بلا چەند یێ نەکێرهاتی بیت. بابێ کچێ چاڤێن خوە ژ راستییێ گریت و دێ خوە کەرکەت هەر وەکی چ ژوی مرۆڤی نە بهیستی ودێ بێژیتن: «هەیی بە کورێ صەیی بە» ودێ کچا خۆ هاڤێتە

ددەریایەك خەمادا یان ژی دێ ڤێ گۆتنێ بێژیت:- [دەما سوعید هاتە سەری بلا بزرت وەکی کەری، خەلکێ بێژن عافەری][2] دیسان ئەڤ گۆتنە ژی وەك یا بەری وێ یا پر پویچە ئەرێ کێ گۆتە..؟

بێ گومانە مەزنا یا گۆتی. ئەرێ گەلۆ ئەم کار بڤان گۆتنا بکەین یان نە لوارێ ئۆلپەرستیێ و رەگەزپەرستی یێ ئەڤ گۆتنا خوارێ دێ ئێتە بەر چاڤان. [ژ صەد فلانێك سەرە ئەو ژی کەرە][3]. ئەڤ گۆتنە بێ گومانە یا هاتی یە گۆتن ژ بەر هەڤ دژیێ یا ئۆلا، ئەرێ بۆچی فەلێن جیهانێ زۆر تێگەهشتینە ژلایێ هزرو پێشەسازی یێ ڤە!؟

وان ئەلەکتریك، رادیۆ، تەلەفزیۆن، مرۆڤێ ئامیری، بالەفر...هتد، یێن سازکرین. ئەرێ مە چ ساز کرە؟

بێگومانە ئەو ژی گۆتنا مەزنا بوو. باشە مەزن کینە دکۆمەلا مەدا؟ وژ هۆیێ چینایەتی ئەڤ گۆتن یا هاتی گۆتن:-

[مێرکێ کورمانج گاڤا تێر خوار دێ مێرکێ کوژت یان ژنەکێ رەڤینیت.][4]. ئەڤ گۆتنا هە یا هاتی گۆتن بۆ کێم کرنا چینا هەژاران یانی دا کو هەر دەم دبەلەنگاز و بێ مال بن، چونکو خویایە ئەڤ گۆتنا هە چینا دەولەمەندا [دەرەبەگا] یا گۆتی وبڤان گۆتنا هەژارا رازی دکەن وەکو دبێژن. [نانێ گەنم ل فەقیرا نایێ][5] باشە بۆچی ل فەقیرا نایێ؟ دا هەر دەرەبەك بخوها ئەینا وان نانێ گەنمی بخۆن، ئەرێ گەلێ کورد ئەڤە نە ژ گۆتنێن کەدخوارانەو دبێژنە ڤان کەدخواران مەزن..؟ چونکو فەقیر ل بن دەستەلاتا وانا دژین لەو ژ بهایێ فەقیران کێم دکەن

2 - نموونە ژ پەندێن هەڤدژ:-

[گربە دا یێ گراڤی بی][6] پاشی یا هاتیە گۆتن: [خوە مەزن نەکە دا تۆ نەشکێ][7] یان دەما گۆتی: [سەرێ خوە هەر بدە دیوارێن کەڤن][8] پاشی یا هاتی یە گۆتن:-

[خەتا خوەهر ژ گایێ پیرە!][9] دیسان یا گۆتی:

[یێ گوهێ خوە نەدت مەزنا دێ لێ هێن شاخێن بزنا][10] ئەرێ کیژ ڤان گۆتنا یا دروستە؟ ئەرێ ئەگەر خەتا خوەهر ژ بن گایێ پیر بت ئان ژ مەزنا دێ بۆچی ئەم گوهێ خۆ دەینێ؟ پاشی مەزنا یا ژبهایێ گەنجا شکاندی وگۆتی:- [ئاقلێ کوری صە تێ برێ][11]. دڤێ گۆتنێدا یێن خۆ گونەهکار کرین ل هەمبەر گەنجا. چونکو ئەڤ گۆتنە دگەل رەورەوا ژیانێدا رێك نا کەڤیت، ژ بەر ئەم دزانین گەنجن کۆمەلا ئاڤادکەن و خۆ ددەنە کۆشتن بۆ رزگاری یا وەلاتان و بەرێ بنگەها ئاڤاکرنا مللەتان دداتن.

نها ژی نە وەك بەری «500» سالایە، گەنجێ نوکە دکاریت دویرۆکا بەری «30000» سالا و پتر بخوینیت، مەزنێ نەخوێندەوار نکاریت بڤی کاری رابیت ژ بەر ڤێ چەندێ گەنج دکاریت سەربوورێن هەمی مللەتان بزانیت لەو ئەڤ گۆتنە پر ڤالایە.

دیسان یا هاتی گۆتن: [ژنا بینە ژ مالا دا خوهارزا بدەن ب خالا][12]. ئەگەر ژن باش نە دەرکەڤت دێ بێژن:

[ژنا نە بژێرە عەسل خێرە][13] پاشی یا گۆتی (عەسلێ ژنێ ژنە)[14]. گۆتنا «12» گەلەك نە یا دروستە چونکو هەر دەرۆنەك (سایکۆلۆژی) یەك دەریایەکا گەلەك فرەهە مرۆڤ نکاریت بچیتە دناڤدا دا کو بزانیت کا چ تێدایەو هەر مرۆڤەکی دەرۆنەك تایبەتی هەیە مەرج نینە کچ وەك دایێ بیت هەر وەکو ئەو دبێژن:- [کچ تەشیا دایێ درێسیت، کور کڤانێ بابێ دکێشیت][15] یا ژ هەمویا دروست تر عەسلێ ژنێ ژنە ئانکو عەسلێ مرۆڤی مرۆڤە.

چونکو هەر ئەو دبێژن [ژ وەلیا دبن خوەلی و ژ خوەلیا دبن وەلی][16] و ئەڤ هەڤدژیە هۆیێ ئەزمونێ یە دەما ئاخاڤتنەك وان نەباش با ل [illegible] دێ دگەرهان!.

3 - نموونە ژ پەندێن قەنج:-

پێویستە چ گۆتنەك لەنگ و کرێت هەیە ئەم کار پێ نەکەین و چ گۆتنەك قەنج و دروست هەیە ئەم کار پێ بکەین و شانازی یێ پێ بکەین وەك [هویر بنێرەو کویر بنێرەو دویر بنێرە][17] براستی فەلسەفەکا گەلەك قەنج یا دڤێ پەندێ دا هەی و [صەبە ژڤەومێ خوە بە][18] ئەڤ

گۆتنە ژی گەلەکا بەرفرەهـ نینە یا گۆتی : [کاری ئیرۆ نە هێلە ژصـــوبــەرا] وا ئەڤـە ژی زۆرا ڤەنجـە. [گـریـا خوە ب دەستـێ خوە ڤەنــەکی کەس ژ تەرا ڤەنـــاکـت][20] . وهــەروەســا یا گۆتی : . [مـرۆڤ هنگی مویکێ ژ بەرازی هلکـێشیت خێــرە][21] براستی ئەڤ گۆتنێن هەیێن ڤەنــج هەموی ژگۆتنێن چینا زەحمەتکێشن چونکۆ لسەر کاری وخۆ مانـدوو کرنێنـە لەو گەلـەك درنـدو ل جهێ خۆ دانە وچاڤێن گەلی ڤە دکـەن بۆ وانـانـا بنگـەهێ کۆمـەڵەکا، چاڤ رۆن وراست و دروست.

هەڤالنۆ ئەڤە کورتە ڤەکۆلینەك بوو ل سەر گۆتنێن پێشیان دا گۆتنێن راست و دروست ژ گۆتنێن پرو پویچ ڤەدەرکەین، وئــەز ناخــوازم کو خورتـێن مە کا چاوا ڤان پەنــدا ئان کو دەڤێ باب و باپیران دبهیسن هەر وەلێ بێخنە سەر رۆپەرێن رۆژنـامـەو گۆڤارێن کوردی وهیڤیدارم دەستێ هاریکارێیێ درێژکەنە ڤەکولین و ل دویڤ چوون و گێنگەشەو رەخنا بۆ خزمەتا مللەتێ‌مە.

ودیسان من چەند بەرێ خۆ دا «مشتاخا چیا ژ گۆتنێن پێشیـا» من چ گۆتنێن ڤەنـج نەدیتن دەرمـافێ ژنێ‌دا ژبلی گۆتنێن کرێت و سەڤـەت کۆ مرۆڤ شەرم دکـەت دەست نیشـان کەت. چونکـو زۆر بهـایێ بێ نزم کری ول دویڤ زانینا نوی ژن نیڤا کۆمەڵێ‌یە.

ژێدەر:


1 - بنێرە مشتاخا چیا ژگۆتنێن پێشیا یا مەلا مەحمودێ دێرشەوی - سالا 1980 - مطبعة شفیق بەداد - لاپەرە: 289 - پەندا: 816

2 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 151 - پەندا: 284

3 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 137 - پەندا: 422

4 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 273 - پەند: 746

5 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 283 - پەندا: ة 777

6 - ژ پەندێن پێشینان.

7 - ژێدەرێ «1»ێ لاپەرە: 92 - پەندا: 248

8 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 196 - پەندا: 441

9 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 96 - پەندا: 265

10 - ژپەندێن پێشینان.

11 - ژێدەرێ «1»ێ - لاپەرە: 15 - پەندا: 30

12 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 162 - پەندا: 433

13 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 162 - پەندا: 434

14 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 220 - پەندا: 518

15 - ژ پەندێن پێشینان.

16 - ژ پەندێن پێشینان.

18 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 212 پەندا: 495

19 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 244 - پەندا: 609

20 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 246 - پەندا: 627

21 - هەمان ژێدەر - لاپەرە: 270 - پەندا: 721


ئەو گەلەی صدام حسین سەرکردایەتی
دەکا دەگاتە لوتکەی بەرزەکانی ژیان

بەبۆنەی تێپەربونی سی[1] ساڵ بەسەر کۆچی دواییدا

# شاكەل

## شاعیری گەرمیان

ئیبراهیم باجەلان

دەشتە گەورەو پانەکەی گەرمیان لە بەهاران دا ئەرازێتەوە، و ئەبێتە گوڵزارێکی بێ‌پایانی رەنگاورەنگ بەدەمی شنەی شەماڵەوە ئەلەرێتەوە، هەروەها بەدەمی گزنگی رۆژەوە پێ ئەکەنی، جار نە جاری چاوەبرکی لەگەڵ ئاوەکەی «سیروان» و«ئەڵەوەن»ە ئەکا وهەستی هەمو مرۆڤێکی دڵ ناسك ئەبزوێنێ. بەتایبەتی شاعیران و هونەرمەندان. هەر ئەم هەرێمە بەدرێژایی مێژووی ئەم گەلە چەندها پیاوی هەڵکەوتوو زاناو شاعیرانی پێ‌گەیاندووە. بەڵام بەداخەوە بەرهەمی کەمیان بۆمان ماوەتەوە، یاکو گەیشتۆتە چاپ، یا لەسەر لاپەرەی گۆڤارو، رۆژنامە کوردییەکانا بڵاو کراونەتەوە. یەکێك لەم رۆڵە هەڵکەوتوو دڵسوزانە شێخ «ئەحمەدی شاکەل)یە ئەم شاعیرە دڵگەرمو عاشیقە کە ژیانی خۆی بۆ خزمەتی وولات و خاکەکەی تەرخان کردووە، وشەیدای دەشتی گەرمیان بووە، بەتایبەتی دۆڵ و هەردەکانی «شاکەل»و «سەیدە»و «کەلار»و «سەید خەل... ئەو «شاکەل»ە کە «مەولەوی»ی نەمر ناوی هێناوە ووتویەتی:

وادەی خاونی‌یەن، وادەی شکارەن
دەشتەکەی پای هەرد شاکەل دیارەن[1]

شاکەلی‌یش لە پارچە شیعرێکدا ئەڵێت:

بەهـاران و ئێـوارەی دەشـتـی سیـروان
ببـارێ جاربـەجـارێ ٭ تاوێ باران
بە سەر بەرگـی گڵ وچـڵ دا بچـۆرێ
جلی سەرمـای زسـتـانـی بگـۆرێ
کە عەکس لێـدا تیـشـکـی خۆراوا
گوڵ و گیـا ئەچـنـە بەرگـی بووك وزاوا
لە دنـیـا مەنـزەرەی وابـێ نەزیـرە
فەرەح بەخـشـی دڵـی میـرو فەقـیـرە
هەر لەهـەمـان پارچـەدا ئەڵـێـت:
جریـوەی مەل لەسـەر بەرگـی گوڵ و گیـا
فوارەی ئاوی روونـاکـی چەم و چیـا
بە جۆشـێـکـی بە کوڵ دێـنـێ بەبـیـرا
سەفـا دێـنـێ بەچـاوی مێـردەپـیـرا

ژیـان و بەرهـەمی شێـخ ئەحمـەدی شاکـەلی

شاعیری ناوبراو ناوی «شێخ ئەحمەد» و کوڕی شێخ محەمحەد کوڕی شێخ سەعیدی شاکەلە. شێخ سەعید باپیـری شاعیـر هەر لە کۆنـەوە لەم ناوچـەیـەدا جێنشین و پەروەردەبـووە. پیـاوێکی بە دەسـەڵات و ناودار بووە. شێخ محـەمـەدی باوکی شاعیـر کاتی وەفـات ئەکات شێخ رەزا ئەبێتـە جێنشینی، جالـەو کاتـەدا «مـەلا مستـەفـایـەکی خولماری»لە شاکەل ئەبێ شیعرێکی داناوە تێیدا مێژووی بە دنیا هاتنی شێخ ئەحمەدی ئاشکرا کردووە کەبڕێ ی نیوە بەیتی یەکـەم مێـژووی لە دایـك بوونی ئەکـاتـەوە ساڵی «1323»ك. شاکـەلی هەر لەکـاتی منـداڵیـەوە لەلای مەلا ناسـراوەکـانی ئەو سەردەمـەدا لە حوجـرە خوێندویەتی تاکو شارەزایەکی باشی پەیداکردووە لە صەرفوو نحوو بەلاغەت و دەرسـە ئاینیـەکـان دا. لە ساڵی (1920)ز دا، دەستی داوەتە شیعر دانان و خەریکی خوێندنەوەی ئەدەبی کوردی بووە، پەیـوەنـدێـکـی بەتـیـنی هەبـووە لەگـەڵ خەڵکی ناوچـەکـەدا، دیسـان لەگـەڵ خەڵکی ئەو دەوروبـەرەیشـدا شناسی و دۆستایەتی هەبووە.

خەڵکی ناوچـەکـە زۆر خۆشیـان و یستـوە، لەبـەرئەوەی شێخی شاعیـر پیـاوێکی راست گۆ، و خوانـاس زۆر بەوەفا بووە ئەو کەسـە هاوڕێتی و دۆستـایـەتی لەگـەڵیا بوایە مەگەر مەرگ لەیەك جیایانی کردبێتەوە، ئەنا برای گیانی و تاسەر بەوەفابووە.

هەر ئەمـەیشـە بووتـە هۆی رێـزلی گرتن و خۆشەویستی ناسراو و خەڵکی ناوچەو رۆشنبیرانی دەوروبەری.
بەرادەیـەك تاکـو ئەو گەنجـە ئەدەب دۆستـانەی رێگایان ئەکەوتە (شاکەل) و(سەیدە) پەیوەندییان لەگەڵیا ئەبەست و لەتەکیەو دیوەخانەکەیدا بەقسە خۆشەکانی شاد ئەبونەوە.
ماوەیـەکی درێـژ لە ژیـانی گیـرۆدەی دەستی ئاوارەیی و هەژاریبـووە لە دەستی زۆرداری ناڵانـدوویـەتی ئاوارەیی بەرۆکـی گرتـووە، و تاڵی هەژاری چێشتـوە، چەنـد جارێکیش دەردی دووری بەشی بووە.

و لە بیرەوەرییەکانی‌دا باسی رووداوەکانی هاوچەرخی خۆی‌کردووە.

لە یەکێـك لە لاپـەڕەکـانی یادداشتـەکانیدا ئەم ڕوداوەی بۆیـادگـاری نووسیـوە ئەمـەیشە یەکێکە لەئەو بەسەرهاتە دڵ تەزێنـانـەی کە مرۆڤ لەبـاری هەژاری وبێ دەرامـەتی‌دا تووشی ئەبێت ئەڵێ: رۆژگاری ساڵانی چلەکان بوو قات وقـڕی و نەهـاتـی‌ی دەرامـەت دوو چاری ڕەوی کردیـن دانیشتـوانی گەرمیـان هەریـەکی ڕووی کردە لایـەك بۆنـان پەیداکردن ئیمەی شاکەلیش زۆر کەم دەس بووین، بەڵام خۆشەویستی و دڵسوزیمان بۆ شاکەل وای لە من کرد، کە دوور نەکـەومـەوە لە شاکـەل، بۆیـە ماڵمـان چوو بۆ دێی «حـەسـەن محـە» کە دێیـەکە توزێك ئاوی هەیەو هەندێ خزمانی خۆشیمانی لێ بوون. نزیکیش لەو وڵاتەوە پاڵی پێـوەنـام زووزوو سەردانی شاکـەل بکـەم. رۆژێك لەگەڵ خێـزانـەکـەم دا خانـەقینەوە بۆ «حەسەن محە» ئەگەڕامەوە و

مناڵیکیشم لەگەڵابوو. . لەبەرئەوەی تەنها سێ درهەمم پێبوو «واتە 150 فلس 1 ـ ب» دابوومە کە للەیەك شەکر چونکو پارەکە کەم بوو، هیچی تری نەئەکرد. کەللەشکرەکەم خستە توورەکەی وولاخەکەم بەرێی کەوتین هەندێ بەپێو هەندێ بەسواری ،جارێ من سوار ئەبووم جارێ خێزانم، وولاخەکە ئەوەندەی ئالیك نەخواردبوو بتوانێ هەرسیانمان هەڵ گرێ بۆیە بەو جۆرە ئەهاتین بەرێدا. ئنجا ئەڵێت: کاتێ گەیشتینە «بەردە سوور» سەیری کەللەشەکرم کرد نەماوە، بە جارێ بێ تاقەت بووم، کاتێش «مغرب» خۆراوابوو، ئەگەر نەگەرێیمەوە بۆ شەکر شەکرمان نیە، ئەگەر ئەشرۆم ژن و منالەکە چی ی لێبکەم . . . ناچاربووم ژن و منالەکەم جێهێلا نزیکەی چارەکە سەعاتێك رۆیشتم، شەکرەکەم دۆزیەوە کەوتبوو، خۆش ترین شت بوو لەژیانم دا، بە پەلە گەرامەوە بۆ لای خێزانەکەم و مژدەم دایەکە شەکرەکەم دۆزیەوەو هاتینۆ بۆ ماڵ.

شاعیری شاکەلی بەرهەمێکی زۆری لە شیعری جۆراوجۆر بۆ بەجێ هیشتووە لە ساڵی 1979 زا مامۆستا جەمال محەمەد محەمەد ئەمین زۆربەی شیعرەکانی شاعیرە کۆ کردوتەوە، وپێشەکیی بۆ نووسیوە چاپی کردووە پاش ساغ کردنەوەی. هەروەکو مامۆستا جەمال ئەڵێت:

لە پێناوی ئەوەدا باشتر لەبەرهەمی شاعیر تێبگەین پێویستە بچینە بنج و بناوانی بەرهەمەکەو بیرو و باوەری شاعیرەکەیش فەراموش نەکەین بۆ ئەوەی بگەینە سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرەکەوە؛ هەروەها نابێت ئەوە لە بیر بکرینەوە کە ئەدەبی کلاسیکی رۆڵێکی گەورەی لەژیان و بیری شاعیر بینیوە، لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکی بەتینی بووە لەگەڵ شێخەکانی «تەوێڵە» «وبیارە»دا، و بەرهەمێکی زۆری هەیە تەرخان کراون بۆ دەربڕینی سۆزی خۆی بەرانبەری شێخەکانی هەر لەبەرئەمەیشە وەکو شاعیرەکانی پێش خۆی پەنای بردووتە سەر ووشەی بێگانە، و لە شاعیرە کوردەکان زیاتر شیعرەکانی مەولەوی و مەحوی و ناری و نالی و بێخود کاریان لێ کردووە. شاعیری خوالێخۆشبو هەندی لە بەرهەمەکانی لە گۆفارو رۆژنامە کوردیەکان بلاو کردۆتەوە بەتایبەتی لە گۆفاری «گەلاوێژ»دا. . شاکەلی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لە توانایدا بووە جێگای خۆی لەناو شاعیرەکاندا بکاتەوە، ئەگەر بهاتبایە تۆزی پەیوەندی خۆی لەگەڵ بەرهەمی ئەم سەردەمەدا بەهێز تربکردایە بەرهەمەکانی بەهێزترو بەپێزتر پێشکەش بە ئەدەبی گەلەکەی ئەکرد شاعیر بێجگە لە دیوانەکەی چەند پارچە شیعرێکی بلاو نەکراوەی هەیە ئەم رۆژە بە هەل ئەزانم رۆژی کۆچی دوایی بۆ بلاوکردنەوەی دو بەرهەمی بلاو نەکراوەی شاعیر کە لەلای بنەماڵەی خۆیدا بەدەستمان کەوتووە.

یەکەم پارچەی ئەم غەزەلەیە کە لە ناووچەی پالانی لەسەر جوگەی مەینەتاوا ووتویەتی و لە دیوانەکەی بلاونەکراوەتەوە تێیدا ئەڵێت:

دڵ لە ناو سینەما بولبول صفەت هاوار ئەکا
ئارەزووی غونچەی لێوی دەمی دڵدار ئەکا
هەر ئەڵێی لێوو دەمی جانانە غونچەی گوڵی هەنار
نەرگس شەهلا بەشوخی ئەو لە چاو یار ئەکا
گەر لەبی لەعل شەککەرباش بخاتە پێکەنین
غونچە دڵ توابێتۆ چاوی گوڵ خونبار ئەکا
دڵ بە غەمزەی چاوی بیمار نگارم خەستەیە
مات و حەیرانم کەخۆی بیمارە چۆن بیمارئەکا
رشتەی ئەگریجەکەی بۆ گرتنی من بائەدا
گەر بڵێم زوڵف لەشکر عەنبەر تاتر ئەکا
چاوەڕوانی رۆینو شێوەی خرامان ئەوە
ئاسکی شاکەل کەوا بۆ لەهجەیە رەفتار ئەکا
دڵ ئەوەن مشتاقی شێوەی چاوی کاڵی دلبەرە
بویە تەعریف چاوی شیعرەکانم سوار ئەکا
شیوەن و گریان و ئاهی بولبول صەد پارە دڵ
هەر لە ناڵەی ئەحمەدی بێ تاقەت و زامار ئەکا

دووهەم پارچەی هەڵبەستی رۆژێك پێش وەفاتی ووتوه واته لە 13 شوباتی 1982ز پاش ئەوەبەیەك رۆژ کۆچی‌دوایی کردووه ماڵ ئاوایی لەگـەل و نیـشتمـانـەکـەی کردووه. بەرهەمەکەیش لەسەر نەوار «شریت» تۆماری کردووه، لەم شیعره دا ئەڵێ:

ئەسیری ئارەزو حوسن لەدەس نەفس و هەوا چی‌بکەم
کە دەردم کاریەو سەختە لەدکتۆر و دەوا چی‌بکەم
بە بی نووری چاوانم سراج الدین و هەم دنیا
بەبێ شەمعێکی کافووری لە تاریکی شەوا چی بکەم
پەناهێکم ئەگەر مابێ، تەمەننامەیەکی عوسمانە *
ئەگەر بیکا بە لوطفی خوا، ئەگەر نەی‌کا خواچی بکەم
نەما کاتی ئیطاعەتم عیبادەتم لە دەس دەرچوو
چی‌یە تەدبیری پیریم و لە شیرینی خەواچی بکەم
لە رۆژی گەرمی هاوینا بەبێ بەرگ و نەوا چی‌بکەم
لە سەرمای سەختی کانونا بەبی خەرقەو کەوا چی بکەم
دەبەسیە شاکەلی دنیا دەمێ، داوای دینێ کە
ئەویش محتاجی شاهێکە بەبێ لطفی خواچی بکەم

شیعری مناسەبەتیش بەشێکی زۆری لە بەرهەمەکانی داگیر کردووه جائـەو مونـاسـەبـەتـە خۆش بێ یا ناخۆش، تاڵ بێ یاشیـرین هیـچ لە مەسـەلـەکـە ناگـۆرێ دەردی دووری لە خۆشـەویست و شاکـەل و کارەساتەکانی ژیان کوچ کردن و گیـرگـرفتی دەروونی ـ هەمـویـان کەرەسـەیەکی رەسەنن بۆ ئەوەی شاعیـر نوکی خامـەی بخـاتـە کاروکانیاوی شیعری بتـەقێ هەر وەهـا [illegible] دوایی ئەنـوەری جوانـەمـەرگی کوری، و خنکاندنی نەسرین لە ئاوی حەوزدا،

کۆچی دوایی شێخ سلێمان، دەردی دووری لە شاکەل، گەشت کردن بۆ بیارەو گەرانەوەی بەدڵ شکاوی ئەمانە وەڵامی نامەی دۆست و برادەرانی . . تاد یەکێك لەم بەرهەمانەی کەوێنەیان زۆرە لە دیوانەکەی پارچە شیعرێکە

لە دووری شاکـەل ووتـویـەتی لە ساڵی «1351»ك کاتێ شاعیر و خزمەکانی ناوچەی شاکەل بەجێ ئەهێڵن، شێخ ئەحمەد لەگـەڵ ماڵی شێخ کەریمـا ئەچنـە گونـدی شێخ غەریب ماڵی شێخ عەبدولقادر ئەچنە لای حاجی خەلیل ئاغای باجەلان لە ناوچەی بن کورە شاعیر بەم چەند بەیتە دوعا خوازی لە شاکەل ئەکا:

تو سپردەی خواوی دەشتەکەی شاکەل
تۆمان جێ هێلا بێ تۆوی ئەمەل
نەیار، نە یاوەر، نە هاو زمانی
نەیان وت پیمان رێ‌ی‌نیشانی
زۆر بە زویری لە میرووگاوان
بە جێمان هێلای تاوەکو زەمان
چیمان لێ ئەکا چونمان ئەژێنێ
ئا خۆ بۆلای تو ئەمان جوولێنێ
تەنها ئومێدێ بۆ لوتفی خوایە
راسە دنیایی هەرکایەو کایە

شاعیـر لە شیعـری ئامـۆژگـاری‌و نیشتمـانپـەروەری‌یش بێ‌بـەش نی‌یـە لە پارچـە شیعـرێکـدا لەژێـر ناوونیشانی ـ خۆشەویستی نیشتمان ـ دا

ئەڵێت:

گیان فیدای دەست و قەڵەم بێ، ئەسپ و زینم بۆچی‌یە
خەت ئەگەر هیمەت بکا برنەو کرینم بۆ چی‌یە
نامەوێ ئەسپی کەحیل و برنەوی کورتی جوان
پاسەوانیم گەر نەکەن حیلەو تەقینم بۆچی‌یە
نا مەوێ دەستی کە یاری بێ دەسێکێ پێ نەدەم
بازوویێ ئازا نەبی بێ هێزوو تینم بۆچی‌یە

هەروەها ئەڵێت:

ئارەزووی بەرزی وەتەن بۆیە بەفەرزم خوێندووە
شادوبێ غەم تیا بژیم هاورێی غەمینم بۆچی‌یە
نیشتمانێکم نەبێ ئاسایشێکی تیابکەم
سەرسەری بم نامەوێ ئەو حاڵە ژینم بۆچی‌یە

شاکەلی‌ی دڵسوزی نیشتمان هەروەها بەدڵ سۆزی‌ما، تاکو دوا هەناسەی ژیانی، کاتێکیش هەواڵی کۆچی دوایی‌ی بڵاو بووەوە شاعیرە دۆست و هاورێکانی بەکوڵ نامەی لاواندنەوە پڕ لە شین و گریانی خۆیان بۆ بنەماڵەی (شاکەلی) ناردووە، مامۆستا (مەلاعبدالکریمی مودەریس لەنامەکەیدا ئەڵێت:

من دڵ سوتاوی مەرگی ئەحمەدم
سوتابە هیجران هەمو جەسەدم
کێ بێ یاد بکەم لە گەرمیانە بێتە حوجرەکەم لە بەربەیانە
بێنی نەسیمی شنەی صەبوری
کە بۆ دەرمانی دەردی مەهجوری
ئاخ لە ئازاری تیرەکەی ئەجەل
داخ لە بۆ دڵداری شێخەکەی شاکەل..

هەروەها هاورێی دێرینی شاعیر حاجی برایمی شاتری بەم بۆنەوە ئەڵێت:

ڕۆژی پێنج شەممە 19 شوبات
لەدیی‌ی سەیدە بوم، زۆر غەمگینومات
چومە ئەو بەردێ‌یە بۆ سەر قەبرستان
بۆ لای ئارامگای ئەولیای زەمان
وتم السلام دۆستە ڕاسەکەم
بە یەقین صاف خوا ناسەکەم
سەلامەت لێ بێ قوتبی گەرمیان
ماڵ ئاوابیت کرد بەجارێ لێمان
ئەستێرەیەك بوی گەش بوی لە سەر کەل
ئەوا ئاوابویت لەدەشت شاکەل .
شاکەل بەبێ تۆ چۆڵ و یرانە
دۆستەکانی تۆ هەمو حەیرانە

هەروەها ئەڵێ:

مزگەوت بێ ئیمام تەکیە بێ زەوقە
هاورێی‌و دراوسێت هەموبێ شەوقە
قوربان تۆ ڕۆییت بۆ جێگەی تازە
خزمو دوستانت هەمو بێ نازە
موبارکت تازە هەوارت هەوارگەی
ئەبەدی دار القرارات

هەروەها مامۆستا مەلا عەلی صالحی زەنگنەیش بۆکۆچی‌دوایی شاکەلی شینی کردووە بەپارچە شیعرێکی خۆی ئەویشە پێویستە دوا وشەمان بێت لەم بارەدا ئەویە کە ئومێدەوارین هەمو بەرهەمە شیعرێکانی (شاکەلی)بە شێوەیەکی ڕێك پێك تر دوبارە چاپ بکرێتەوە ، هەروەها یادداشتەکانی‌یش چاپ بدریت بۆنەوەی نەوەی تازە سوودی لێ‌وەرگرن.


سەرچاوەکان:

(1) بڕوانە دیوانی (مەولەوی) لە کۆکردنەوەو لێکوڵینەوە و لێکدانەوە، لەسەرنووسینی ، مامۆستا عبدالکریمی موددەریس بەغدا چاپخانەی (النجاح 1961 ز ولا373).
(2) دیوانی شاکەلی / ساغ کردنەوەی جەمال محەممەد محەممەد ئەمین چاپخانەی الامەر بەغدا 1979.
(3) چەند دەس نووسێکی شاعیر
(4) شەریتێکی تۆمار کراو بە بۆنەی کۆچی‌دوایی شاعیرەوە.


* مەبەستی‌ئەم (عوسمانە) شێخ عوسمانی کوڕی شێخ علاء الدین نەقشبەندی‌یە
خواوێ. حوبی یاوەر :خاوری

# ژ تـــوری جیـهــانــی

وەرگێرانا: بدل رفو مزوری
ژ ئەزمانێ روسی بو کوردی

## ١- یڤگێینی باراتینسکی


ЕВГЕНИЙ БАРАТЫНСКИЙ

هوزانڤانێ روسی یێ بناڤ و دەنگ «یڤگێینی ابرموڤچ بارا - تینسکی» چاڤێت خو ێت ڤەکرین ل هەرێما «تامبوف» لسالا 1800ز، ژ مالەکا خانەدان و هەیی بیە. هوزانێت باراتینسکی پەسنا چاکییێت مروڤایتییێ و هزرو بیرێت سەربەست دکەت د هوزانێت ناڤبرییدا ئەوێت هاتینە نڤیسین پشتی رەڤینا راپەرینا «دیسەمبەرێ» وناڤەروکا فەلسەفی و تەپە سەریا روژا ڤەژینێ [لسەر مرنا گیوت، مرنا دویماهیکێ، ژ بوچ ئەی فەلەك ... هتد]. رەنگێ هوزانێ یێ خوشتڤێ ل نك ناڤبری هوزانێن «پێ گوتنا»نە وەك ئەڤان هوزانا [زرین، چاڤەرێ ،بێ گومان، وەراندنا بەلگا ... هتد].

رامانا فەلسەفا کویرو پێشکەفتی و پاقژ یا هوزانێت باراتینسکی ئەوێت برەنگێ پێ گوتنێ هاتینە نڤیسین ،هەر وەسا چێکرنا بڤان و ئاوازێت جوان ببونە ئەگرا ناڤ و دەنگییا وی وببیتە باشترین هوزانڤان د ناڤ هوزانڤانێت روسی دا د چاخێ پوشکین دا، ناڤبری چاڤێت خو دانانە سەر ئێك لسالا 1844ز ئەڤەژی هوزانەکا هوزانڤانی یە:

«دەڤ گازندە»

نێزیکە . نێزیکە روژا پێك کەفتنێ
دێ تە بینم، ئەی هەڤال!
وبێژە من بوچی دلێ من
لێ نادەت بخوشییا نێزیك بوینێ؟
نە ئەزم دەڤ گازندە،
بەلێ روژێت خەمگین، چێدبیتن،
بوریین د وەختەکێ درەنگە دا.
بهەڤالینییا دێ سەحکەمە خوشییا
نێ روناهییا وان نە بو منن.

بێ بهایە هوشیار بکەم سپاردنێ
د گیانێ خو یێ پوسیدەدا.
نێ تاما خوشی‌یێ ئەز تام نا کەم
بگرنژینا چارەنوسا بشکفتی.
هەمی تشت د ئاشوبی‌نە
بەلکی ئەزێ شادم بهەلنگلینێت خو،
بتشتێ ئاشوبی،
نێ خوشی نەبو روێت منن!


НИКОЛАЙ ЯЗЫКОВ
(1803—1847)

## 2 ـ نیکولای یازیکوڤ

هوزانڤـانێ روسی «نیکـولای یازیکـوڤ»ل دەڤـەرا «سیمبیرسك» یا نوکە دبێژنێ «اولیانوڤسك» لسالا 1803ز ژ دایێ بیە ژ ماڵەکا خانەدان، ژ چینا دەولەمەندا. هزرو بیرێت بەردەوام دیارن د هوزانێت «یازیکوڤ»ی‌دا، ئەون ڤیانا سەربەستی‌یێ وبوراندنا ژیانێ بدل خوشی‌و شادمانی.

هوزانێت ئاڤبـری یێت دویمـاهیێ گەلەك لایێت ئۆل پەرستی‌یێ یێت تێدا «تصوف». هەلبەستێت یازیکوڤ یێت هاتی‌نە زلنین کو براماـن و ئەنجامێن خویاو بەرکەفتی‌نە وێت بۆینە سترانێت میللی ... جەماوەرێ روسی پێ د سترین وەك [ژ باژێرا .. باژێرێت دویر، دەریا مە یا بتنێ یە].

هوزانڤان لسالا 1847 مالا خو بارکرو خاترا خوژ جیهانێ خاست پشتی سامانەکێ هێژاو خویا لدویڤ خو هێلای. ئەڤەژی پارچەکە ژ هوزانەکا وی یا درێژ بناڤێ:

«سترانەك»

ژ باژێرا .. باژێرێت دویر
ژ ڤولکا ـ دەیکا مەزن
ژبو کارەکێ شرین و بەرکەفتی،
ژ بو سەربەستی‌یا بەرز
ئەم هەمی لڤێرێ کۆم بوین.
د ئینە بیرا خو چیا
گەلی‌یا
مەزارو پەرست گەها

د ئینە بیرا خو کوخ و گوندا
دێ دەهوتا مەزن دانین وێ
ژ بو وەلاتێ قەشەنگ دێ سترین.
بەلێ بهەڤالینی‌یا هیڤی‌یا سەرسام
جامێت شەرابێ دێ دەنگ ڤەدەن،
وبلا وەلاتێ من بمینیت شاهنشینا ئێکێ
لبن ئەسمانی.
دلخوش و سەرفرازا

xx xx

ژێدەر:ـ

# راپورتێ روشەنبیری بەیان

# راپورتێ دهوك

## بزاڤێد رەوشەنبیری

● هەكار دوسكی ●

روژ بو روژێ بزاڤا رەوشەنبیری ل دهوكا داسنیا ب وەراو هێز دكەڤیت و بەر ب سەركەتن و بلندی ڤە دچیت. روناهیێ بەر دەتە سەر هەمی قولاچێد تاری. دەزگەهێد رەوشەنبیری ئەڤ خەتیرە یا هلگرتی‌و لپیشیا كاروانی دچیت.

لروژا 1985/3/23 هێژا عبدالكریم فندی دوسكی كوجكێ دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤكرنا كوردی گەرم كرو كورەكا بنرخ و بها دەربارەی (سمكو خانێ شكاك) گێراو دیار كر كانێ چەوا عەجەمێد توخم پەرست دوژمناتیەكا كەڤن و كویر دگەل مللەتێ كورد یا هەی.

هەمی بزاڤێد سمكوێ شكاك خویا كرن و بدژێژی لسەر ئاخفت و چەند سترانێد فولكلوری ئەڤێد هاتینە گوتن ب بزاڤێد سمكوی ئێخستن بەرگوه. مشە ئالوزیێد مێژوی مژ و موران ژ سەر دا قوتا. دوماهیێ كەهشتە چەند ئەنجاما كو سمكو: مروڤەكێ نیشتمان پەروەر بویە، دڤیا رێڤەبەریەكا كوردی ل كوردستانا ئیرانێ دروستكەت. سمكو خان نەبو داردەست بو ئیمیالیا.

سمكو خانێ شكاك بخوە سەربور ژ فەندێد عەجەما نەگرت، نەشیا ژ گیخا هوزا خوە دەركڤیت.

سەیدا عبدالكریم مفاوج ژ (27) بیست و حەفت ژێدەرا دیبو. هەژی گوتنێ‌یە ڤێ كورێ پتر ژ دو سەعەتا كێشا.

● ئێڤارا 1985/4/6 رێڤەبەریا جەماوەری كورەك بەست بو كاك كریم جمیل بیانی لسەر (چیروكا راڤە شێرو چەند تێبینی) كاك كریم بسەر بابەتێ خوەدا جو خوارێ‌و ملێد خوە دبەر چیروكێ را برن و كت كتە تێبینێد خوە هاڤیتنە جوخینێ وەك: زمانێ چیروك نفیسی، لێكدانا رستا، هزرو بیرو فەقەتاندنا وان جا جارا لهندەك جها. هەتا بوینە كومەك. پشتی كور بدوماهی هاتی مشە برادەرا كاغزو دەرگەهێ ئاخفتنێ ژ خوە را ڤەكر. وەك سەیدا

سکڤان عبدالحکیم و گوت «هندەك دژواری دزمانیٚ کاك کریم جمیــل دا هەبــو دەمیٚ خالیٚــد خوە دهــاڤیٚتنە بەر گوهدارا. کاك کریم بەرسڤ داو گوت: من نەوشیا نەرم تر لیٚکەم. کوریٚ پتر ژ سەعەتەکیٚ کیٚشا.

● د بیرهــاتنــا چەژنــا روژنامەگەریا کوردی دا دەزگەها رەوشــەنبیــریو بەلاڤکــرنا کوردی کورەکا بەر فرەهـ ل ئیٚڤارا 1985/4/22یٚ بو هوزانڤــانیٚ گەنــج و تولاز (رمضــان عیسی) بەست. تیٚدا بەحسیٚ هوزانا هەڤ چەرخ کرو مشە نمــونــە پیٚش چاڤکــرن و گوت: ما چ قوســویــریــە هەکــە بەحسیٚ خوە ژی بکەم وەك هوژانڤان!!

● ل ئیٚــڤــارا 1985/4/25 جارەکــا دی ل هولا چالاکییٚد فیٚــرگــەها کوما ئەدیب و رەوشەنبیرا هاتە بەستن و گوڤەندا وان کەملیو گوهـ مانە ڤەجنی ب گوتن و ئاخفتنیٚد هیٚــژا «ئــەمینیٚ ئوسمــانیٚ» ڤە چاخیٚ بسەر سوحبەتا (مەم و زین)ی، ڤە چویە خواریو دیار کر کانیٚ چەند جارا ئەڤ داستانە هاتیە چاپکرن. جودایو گلیٚرییٚد د نابەتنا وان دا دەست نیشــان کرن. ل دومــاهیــا کوریٚ چەنــد پسیار ژیٚ هاتــنــە کرن براستی هیٚــژا ئەمینیٚ ئوسمــانیٚ دەملدەست پەرسڤ ددان.

جار جارا سوحبەت و گوتنیٚد تەرو دل ڤەکەر د ناڤدا د ئیٚنــان ئەڤ کورە هاتبــو سازکــرن ژ لایٚ ریٚڤــەبــەریــا جەماوەری. ڤە ل دهوکیٚ.

● ل ئیٚڤــارا 1985/4/27یٚ ژڤــان دگــەل سەیــدا عبدالکریم فندی بو ل دەم ژمیٚر (5) پیٚنج. هولا جالاکییٚد فیٚــرگــەهی مشت بو، کوجکیٚ دەزگــەهــا رەوشــەنبیــریو بەلاڤکرنا کوردی گەرم بو.

سەیدا لپشت میٚکرەفونیٚ دو تابو دەست ب بابەتیٚ خوە کر بیٚ لبــن ناڤ و نیــشـــانــیٚ «کــوڤـــارا ژیــن د کاروانــیٚ روژنامەگەریا کوردیدا». تیٚدا دیار کر کو کوڤارا «ژین» د بایــزا سالا 1918یٚ دا ل ستــامبــولیٚ دەرکــەتبــو. ئورگــانــا نەرەسمی یا کومەلا پیٚشکەتنا کوردستانیٚ بویە «ژین» ـ 25 ـ بیست و پیٚنــج ژمــارە ژیٚ هاتینــە وەشــاندن. میٚژوا ژمارا ئیٚکیٚ 1918/11/7یە.

دڤیٚ ژمــاریٚدا ب نڤیسینــەکــا کورت ب سەرنڤیسینــا «ئامانجا مە» سەمەدیٚ (سەبەب) وەشاندنا کوڤاریٚو ئامانجا ویٚ وەها هاتیە راگەهاندن: «ژین نە ژبو ب دەستخستنا لشتەکا (منفعە) مادی دەردکە ڤە. ئامانجا ویٚ، بەلاڤکرنا زانینیٚ یە ل سەر ژیانا کوردا یا دیروکی، هەقیٚ وی یێ نەتەوەی، بیٚژەیا ویو رەوشا وی یا چڤاکی».

کوڤــارا «ژین» ب ویٚ باوەرییٚو ب ویٚ بریــاریٚ ژیــانــا خوە نیزیکی سالەکیٚ بوراندیە. ژمارا ویٚ یا پاشین یانی یا (25) بیست و پیٚنجیٚ د روژا 1919/10/2یٚ دا دەرکەتیە.

کوڤار پشتی هنگی هاتیە گرتن و د دیروکا روژنامەگەریا کوردیدا هاتیــە ڤەشــارتن. سەیــدا عبدالکریم چەند هزرو بیریٚد نوی دەربارەی ڤیٚ کوڤاریٚ دیارکرن و کەتە کیٚشان و پیڤــانــا دگــەل هزرو بیــریٚــد بەری نهــو هاتینــە دان دراستــا کوڤــاریٚدا، چەنــد ژوان راستکــرن ل دوی تویــژاندنا هیٚژا «محمد أمین بوزأرسلان» ل سەر ڤیٚ گوڤاریٚ کریو لبەك (دانە) ژ سەیدا عبدالکریم فندی را ب دیاری فریکری. براستی بابەتەکیٚ نوی بو چەند تشتیٚد مە نەبهیستین تیٚدا دیار بون و چەند هوژانڤانیٚد نوی بەرهەمیٚد وان کەتن بەر دەستیٚد ئەدیب و ئەدیب دوستیٚد کورد وەك:

عبــدالــرحیم رەحمی هەکــاری، زاخــویی و سویٚــرەکی.

دومــاهیــیٚ کاك حجی جعفــر ئاخفت و گوت: بمن وەرە عبدالکریم فندی خوە نەوەستاندیە ژ بەر کیٚم ژیٚدەر دەست نیشــان کرن بەلیٚ سەیــدا عبــدالکــریم بەرسڤ داو گوت: مانیٚ کیٚم ژیٚــدەر یٚــد هەین دەربــارەی ڤیٚ کوڤــاریٚو گوتیٚ ئەڤە هرج ما دەوس بو چیە. نیزیکی دو سەعەتا ئەم هەمی ماینە دگەل نڤیسینیٚد خەبات کەریٚد کورد.

# ئێوارەی سلێمانی

## «کۆڕێك بۆ چیرۆك و ڕەخنە»





یەکێتی ئەدیبانو نووسەرانی کورد لقی سلێمانی بەردەوامە لەچالاکی یە ئەدەبی و ڕۆشنبیریەکانی خۆیدا لە زنجیرەی ئەو کۆڕانەدا کە لیژنەی ڕۆشنبیری بڕیاری لەسەر داوە ئێوارەی پێنج شەممە 1985/6/27 کۆڕێکی بۆ چیرۆك و ڕەخنە سازکرد. لەم کۆڕەدا چیرۆك نووس مامۆستا - محمد رشید فتاح - چیرۆکێکی خوێندەوە بەنێوی - مەجوڵ - ەوە. پاش ئەو ئەدیبی لاو کاك - ئومێد ئاشنا - ڕەخنە لێکۆڵینەوەی خۆی سەبارەت بەچیرۆکەکە


- باوکی شنە -

ئامادە کردووە


پێشکەش کرد. ناوەرۆکی چیرۆکەکەی مامۆستا - محمد رشید فتاح - لەو بابەتە زیندووانەبوون کە لە نێو جەرگەی کۆمەڵدا ڕووی داوەو باسی کێشەو گیروگرفتی کەسانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵی دەکرد، کەسێکی وەك - مەجوڵ - کە گیرۆدەی ئەو شەپۆل و گێژاوانە بووە نموونەیە بۆ هەزاران کەسی وەك ئەو. پاش ئەوەی چیرۆك نووس چیرۆکەکەی خۆی خوێندەوە کاك - ئومێد ئاشنا - ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی خۆی سەبارەت بەچیرۆکەکە پێشکەش کرد. ناوەرۆکی چیرۆکەکەی مامۆستا - محمد رشید فتاح - لەو بابەتە زیندووانەبوون کە لە نێو جەرگەی کۆمەڵدا ڕووی داوەو باسی کێشەو گیروگرفتی کەسانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵی دەکرد، کەسێکی وەك - مەجوڵ - کە گیرۆدەی ئەو شەپۆل و گێژاوانە بووە نموونەیە بۆ هەزاران کەسی وەك ئەو. پاش ئەوەی چیرۆك نووس چیرۆکەکەی خۆی خوێندەوە کاك - ئومێد ئاشنا - ڕەخنەو لێکۆڵینەوەکەی خۆی پێشکەش کرد کە بەم ناونیشا نەبوو: «چیرۆکی مەجوڵ - لە ئاستی شێوەنوێ و بابەتێکی هاوچەرخانەدا - ڕەخنەگر لە هەردوو لایەنەکەی شێوەو ناوەرۆکەوە چیرۆکەکەی هەڵ سەنگاند سەرەتا بەم شێوەیە دەستی پێکرد: «یەکێك لەو مەرجانەی کە دەبێتە هۆی سەرکەوتنی شێوەو پێ بەخشینی سیفاتی هاوچەرخێتی وێنەو بەکارهێنانی لێك چواندن و واتایە، کە ئەگەر چیرۆك نووس وێنەکانی یەك ئەوی تری نەسڕیەوەو لێك چواندنەکانی ئاوەژوو نەبوون و واتاکانی دژ بەیەکتری نەبوون ئەوا دیارە ڕادەی سەرکەوتنی بەرز دەبێتەوە چیرۆك نووس لەپاڵ ئەوەی کەوێنەو واتاولێك

چوانـدنی چیـرۆك نووسـانـەی جوانی بەکـارهێناوە بەرانبەر ئەوەش کەوتـوّتـە هەنـدێ هەڵـەو ناتـەواوی‌و غەفڵەتـەوە کە ناتـوانین یەکـە یەکـە دەست نیشـانیـان نەکـەین. سەرەتا با تەماشای وێنەو واتاو لێك چواندنی جوان و سەرکەوتو بکەین لە دوای ئەمــەش ئەو خاڵانـەی کە دەبنـە رەخنـە لە رووی شێوەوە بۆ چیرۆك نووس، ئینجا کاك ـ ئومێد ئاشنا ـ بە نۆ خاڵ دەست نیشانی لایەنە باشەکانی کردو بە چواردە خاڵیش لایـەنـە ناتـەواوەکـانی هەڵســەنگاند. دوای لایەنی شێوەی چیرۆکەکە هاتە سەر ناوەرۆك و چیرۆکەکە. ئەو رەمزەی بەم جۆرە لە چیـرۆکـەکـەدا بەکـارهێنـراوە لای چیـرۆك نووس ناچێتە رەمزێکی سەرکەوتووەوە چونکە ـ دەلالەتی ـ تەواوی نی‌یـەو روونی‌و ئاشکـرایی ـ وضـوحـ ـی تیـا نیـە پاڵـەوانی چیـرۆکـەکـە خاوەن گیـروگرفت و ئازارە لەوەوە دەیەوێ شتە ئاڵـۆزەکـان خاو بکـاتـەوەو سەرێ تاڵـە دەزووەکـان دیـاری بکـات. هەروەهـا چیـرۆك نووس لە هەڵبژاردنی کەسێکی وەك ـ مەجـوّل ـ بەو سیفـاتـانـەوە سەرکـەوتنی بەدەست هێنـاوە. چیـرۆك و رەخنـەکـە جێی رەزامەندی گوێگرانی کۆرەکــە بوون کە ژمــارەیـەکی زۆر لەئـەدەب دۆستـان لە لاوان و کیژانی تینوی ئەم جۆرەکۆرانە ئامادەبوون کۆرەکە نزیکەی سێ سەعاتی خایاندو ئەوەی شایانی باسە کاك ـ ساجد ئاوارە ـ کۆرەکەی دەبرد بەرێوە.

---

## «پیشانگەی هاوبەشی دارا و هیوا»

---

هۆڵی مۆزەخـانـەی سلێمـانی لە 18ی حوزەیران داو بۆ ماوەی حەوت رۆژ میـوانـداری پێشـانگـەی هاوبـەشی هونەرمەندان ـ دارا محمد احمد ـ و ـ هیوا کەریم ـ ی کرد پێشـانگـەکـەش لەلایـەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد مەڵبـەنـدی گشتی سلێمـانی‌یەوە سازکرا بوو. ـ دارا ـ ی هونەرمەند بەسی‌و شەش تابلۆ بەشداری کردبوو کە بیست و





سێ تابلۆیان زەیتی‌و ئەوانی دیکە تخطیط و بۆیەی ئاویان لەگەڵدا بەکار هێنرابوو. بەلام ـ هیوا کەریم ـ بیست و نۆ تابلۆی پێشکەش کرد کە بریتی‌بوون لە یەك تابلۆی زەیتی‌و دوو تخطیــط و چوار تابلۆی ئاوی‌و تابلۆیــەکی ـ فحم ـ سەربـاری کۆمـەڵێك سکێچات لەراستیدا سەرباری ئەوەی پێشـانگـە کە شێـوەی کارێکی ئەکادیمی بەسەریدا زاڵ بوو بەتایبەتی کە ئەو دووبرا هونەرمەندە لە دەرچووانی ساڵی ـ 1985 ـی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانین، بەلام خۆشــەویــســتــی‌یــان بۆ ئەو هونــەرە خەریــك بوون و خۆماندووکردنی ساڵانی پێش چوونە پێشانگەی پێوە دیاربوو کە ئەمـەش لەخـۆیـدا گەرانـە بەدوای خەمـڵانـدنی بەهرەو توانـای داهێنـانـدا. ئەکـەرچی وەك هەرسـەرەتـاو دەست پێ کــردنێــك کار لێ کــردن و تا رادەیــەکی کەم لاسایی

کردنەوەی چەند هونەرمەندێکی دی لە ئیشەکەیاندا دەبینرا وەك تابلۆی - دیمەنیء ناوبازار - ی داراو تابلۆی - کۆمەڵێك ئەسپ لە غاردا - ی هیوا.

دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانیش وەك ڕەوشتی هونەری خۆیان سەبارەت بەم پێشانگەیە بۆ جەماوەریان نووسیوەو دەڵێن:

کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لەسلێمانی پێشانگەی هونەرمەندان - دارا محمد احمد و هیوا کەریم - پێشکەش بەجەماوەری خۆشەویست ئەکات لەگەڵ چەپکە گوڵی ڕێزو خۆشەویستیو ڕەخساندنی بارو زروفی لەبار بۆ بۆ هونەرێکی کوردی ڕەسەن و هاوچەرخ کۆمەڵەکەمان بەگیانێکی خۆشەویستی هونەرەوە دەرگای خستۆتەسەر پشت و چاکی دڵسۆزی کردووە بەلادا تاپێتە نیکەیەکی پرشنگدار بۆ بزوتنەوەی هەموو هونەرێکی ڕاستەقینە لەشارە خۆشەویستەکەمانا بەهیوای ڕەزامەندیتان ئەوەی لێرەدا پێویستە بەخوێنەری هێژای بڵێین ئەوەیە کە - دارا محمد - ساڵی 1963 - لەگەڕەکی چوارباخ لەسلێمانی لەدایك بووە.

● ساڵی 1980 لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی وەرگیراوە.

● ساڵی 83 - 84 - 85 بەشداری ڤستڤاڵی ساڵانەی پەیمانگەی کردووە.

بەڵام - هیوا کەریم - ساڵی 1965 لە قەرەداغ لەدایك بووە.

● ساڵی 1980 لەپەیمانگەی هونەرە جوانەکان لەسلێمانی وەرگیراوە.

● ساڵی 82 - 983 - 84 - 85 بەشداری ڤستڤاڵی ساڵانەی پەیمانگەی کردووە.

لە کۆتاییدا هیوای هەنگاوی بەپێزو داهێنانی زێتر بۆ ئەو دووبرا هونەرمەندە دەخوازین.

---

ر.ك

# شانۆی بازنەیی و تاقیکردنەوەی شانۆیی «السید و تابعە»

مایەی بەختەوەری هەموان بوو کە قوتابیەکانی ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکان ئەمساڵ بەپێچەوانەی ساڵانەوە دوو شانۆیی یان پێش کەش کرد، یەکەمیان شانۆیی «دیدەنی» دەرهێنانی هونەرمەند (ئیبراهیم چێوار) و وەرگیری: رؤوف بێگەرد، دووەمیشیان: شانۆیی (السید وتابعە) نوسینی لارس فورسیل ی سویدیو دەرهێنانی کاك (دلاوەر قەرەداغی) کە ڕۆژانی «13 - 14 /4/1985 لە هۆڵی کۆمەڵەی روشنبیری کوردی بەغدا پێشکەش کرا.

پێ بەپێی تاقی کردنەوە نوێیەکانی شانۆی نوێ هونەرمەندە لاوە ئەکادیمی یەکانمان تاقیکردنەوەکانیان پیش کەش دەکەن، بەم گورانەش بینەری ڕۆشنبیر لە زانکۆ و ئەدیب و هونەرمەندانی کورد بەم تاقیکردنەوانە ئەشنا دەکەن، کە کار دەکەنە سەر چێژی تەماشاکردن و پێش کەش کردنی نوێکاری لە شانۆی کوردیدا!!

ئەم شانۆیی یە تافیکارەی کاکە دلاوەر قەرەداغی خۆی لە (شانۆی بازنەیی)دا ئەبینێتەوە. بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە لە دەرهێنان کاکە دلاوەر قەرەداغی لەسەر سێ روانگەکەی (شوێنە بۆشایی و ئەکتەر و بینەر) ڕۆیشت کە هەموو جیگایەکی بەربلاو لە سروشت دا دەتوانین بە هۆی ئەو سێ بەهایەوە شانۆیی تیا پێش کەش بکەین. کەگرنگی تەواوی نەدا بوو بە دەقە شانۆیی یەکە و گرنگی بە جولاندنەوەی ئەکتەر و دوور کەوتنەوە لە شانۆی زەخرەفە و باق و بریقی جل و بەرگ و دیکۆر و ماکێژ

بەهـا فەلسـەفـەیـەکـانی تر دابـوو، کە بروك ئەڵێت: «ئـەکتەری وورياو لەش نەرمی گەرەگە» هەر چەندە برایان «کریم هاشم» لە کاراکتـەری «پیـاو»و «ولیـد عبدالله» لە کاراکتەری «شارلی»دا تا رادەیەك نەیانتوانی ئەو ئەکتەرە لێهاتوانە بن کە لە جولاندنەوە و گەیاندنی کردارە درامی‌یەکان و پانتۆمایم دا تەرمی ئەندامەکان و لەش و پەنجـە ودەست و دەم و چاو بگـەیـەنن، چونکـە جوڵە لە شانـۆیی بازنـەیی دا ئەبێ جێگـەی دیـالـۆژ و ووشـە بگرنەوە کە دەرهێنەر پەیرەوی کردبون. وەك لە دیمەنی سەرەتای پانتۆمایم دا بینیمان چرو پری فەلسەفەی دەرهێنەر بە دیمەنێك پیشکە شکرا کە ئەو بەهایانەی لێ‌یان دەڕوایین بە ئاکام نەهاتن لە لایەکی ترەوە کاری دەرهێنان و نواندن ئەبێ لە «360» پلەدا خۆی بینیتەوە، ئەمـەو هەنـدێ کردەی درامی گرنـگ هەبـوون کە پـێویستیان بە گەلێ گۆشە هەبوو لای تیشکوی چاوی بینەران کە «360»پلەیە لەوانە شارلی «انت التي هناك ايتها الطيف اللذيذ!!» کە تەنها رووی لە خواررووی چەپی کردبو کە دوو گۆشەی گرتبۆوە، ئەم دیـالـۆژە گرنگی لە هەمـوو گۆشـەکـان ئەبێ لە مامـەڵـە کردنی دەرهێنانی شانۆیی بازنەیی دا زیاتر بێ!!

یان پیـاوەکـە ئەڵێت: «انني اموت» جولانـدنەوەی گەرانی بە «بـوون»دا بە دووای سەری پەتـەکـەدا کە زۆر بەدەوری کورسی‌یـەکـەدا خولایـەوە لێرەدا کورت کردنـەوەی ئەم جوڵـەیە چاکتر ئەبوو ئەگەر پەیرە و بکرایە. بەڵام هەندێ کردەی درامی تر سەرنجی راکیشام کە جوانکاری مل ملانێ کەی زیاتر کرد بوو کە پیاوەکە دوایی شارلی ئەکەوت بۆ بریندار کردنی و خوێن خواردنەوەی کە زیرەکانە جێ‌بەجێ کرابوو وەیان بەرز کردنەوەی پەتی سیدارەکەی ملی «شارلی» لە لایەن (ولید عبدالله) وە بۆ هەمو بینەر و خولانەوەیەکی 360 پلەکی مەبەستەکەی بە چاکی پێکا بوو. لە لایەکی ترەوە دەرهێنەر زیرەکانە ئیکسپواری لە بری دیکـور بەکـار هێنـا بوو کە سیمـای شانـۆیی بازنـەیی‌یـە لەوانـە سنـدووقیـك و پەتیـك و کورسی‌یـەك و عەبـایەکی رەش و سوور هەرچەندە ئەم شتانە لە زۆر شانۆیی تاقی کردنەوەی تردا بینرا بوونەوە ، بەڵام خۆزگا کاك دلاوەر هەندێ شتی بەکار بهێنایە کە خامەو زادەی بیرتیژی دەرهێنەر یان زیاتر دەکرد بەڵام وەك تاقی کردنـەوەیـەکـی نوێ بەپێـویـستی دەزانم بڵێم: کاك دلاوەر قەرەداغی هەنگـاوێکی چاکتـری بەسـەر شانـۆیی «کـانکان ئەو پیـاوەی دووجـار مرد»دا ناو سەلمـانـدی کە هەنگـاوی تاقی کردنـەوەکـانی بەرە و چاکتـرین دەچن. کاك دلاوەر توانیبـوی زیـرەکـانە بەهۆی باری رەوانی گشتی و ایقاعی گشتی و باری سریالی و زاڵ بوون و بینـاکـردنی شانـۆی پیشـرەوە وە سروشتی شانۆی سویدی و زاڵ بونی رەشبینی تەکنولوژیا بەسەر سروشتی جوانی شانۆیی‌یەکەدا بەئـاکـام بهێنێ توانی بەهـا فەلسـەفی‌یـەکـانی جوانی رەوشت و هەڵس و کەوتی مرۆڤـایـەتی لای (شـارلی)و زاڵ بوونی بەهـای نامرۆڤانەی بۆرژوا لای پیاوە کە بەئاکام بهێنێ لە مل ملانێ ی دەقـەکـەدا، کە جولانـەوە تەکنیکی یەکانی دەرهێنان بەپێز بوون بەگشتی لەرووی بەکارهێنانی پەتەکە لە ملی شارلی و دوور بینی مروڤ و تقمص کردنی بارە ئاژەڵی‌یـەکـانی لە کاتی نامـۆ بونـدا لای. بەڵام بەرامبەر ئەکتەر هەندێ جار ئەو بەها ئیستاتیکی‌یانە دەستە وەستان ئەبوون، بۆ نموونە: هێزی دەنگ و روونی دیالۆژ هەنـدێ جار لای کریم هاشم وون ئەبـوون بەپێچـەوانـە شەوە برادەر (ولیـد عبـدالله) دیـالـۆژ و ووتنی و راست گۆیی تیا بەدی ئەکرا ، ئەگەر لە رووی نەرمی لەشەوە زیاتر ماندو بوونی پێوە دیار بوایە گۆشەکانی جولاندنەوە بەئاکام دەگەیەشتن کە ئەمەیان لای کریم هاشم لە هەنـدێ حاڵـەتـدا جوان ئەهـاتنـە دەست لە جولاندنەوە و جێ بەجێ کردنی کردە درامی‌یەکاندا. لەکۆتایی‌دا ریزو گەورەیی و خۆشەویستی بۆ.

کاکە دلاوەر قەرەداغی و کاکە کریم هاشم و ولید عبدالله و هەمـوو بەشـداران ئەخـوازین و هیـوادارین تاقی‌کـردنـەوەکـانی داهـاتـوو ئیسپـاتی جوانی بەهـاکـان بن چونکـە بەراستی لە ماوەیەکی کورت و باریکی تایبەتی دا ئەم کۆرپەیە لە دایك بوو، هیوادارین ئەم تاقی‌کردنەوانە شارەکانی تری کوردستان بگرنەوە تا بینەرانی لێ بێ بەری نەکرێن و دەستی ئەم کارانە بگیرێت و دوور کەونـەوە لە بینـەری تایبـەتی (نـوخبـە) و خۆیـان بە هەموو هۆڵەکانی شارەکانی تردا بکەن.

تێبینی: ئەم شانۆیە بە زمانی عەرەبی پیش کەش کرا.

# یانەی بەیان

* بۆ خاوەنی چیرۆکی (هەستێکی زامدار):

کاکە ئەم بەرهەمەت زۆر لاوازبوو، بۆبلاوکردنەوە نەشیا، چاوەڕوانی بەرهەمی چاکترت لێ دەکەین.

* بۆ خاوەنی (فێ)و (ڕێکەوت):

زمانێکی پاراوت هەیە، بەڵام ئەوەی نووسیبووت چیرۆك نەبوو، ببورە.

* بۆ خاوەنی (چیرۆکەکا فولکوری‌و چەند هزرووبیر):

کاکە ببورە لەبڵاونەکردنەوەی نووسینەکەت، چونکە مەرجی نووسینی مەوزوعی تیا نەبوو.

* بۆ خاوەنی (بزەیەك لەکاتی خۆی):

کاکە کوردیەکەت باشە، بەڵام چیرۆکەکەت کۆك نەبوو لێڵ و پچڕپچڕ بوو . . چاوەڕوانی بەرهەمی چاکترت لێ دەکەین،

* بۆ خاوەنی (چاوەڕوانی):

ئەوەی نووسیبووت کاڵ و کرچ بوو ببورە.

* بۆ خاوەنی (زەماوەند):

هەرچەندە زمانەکەت چاکەو لەبەهرەی نووسینیش دوور نیت بەڵام ئەم بەرهەمەت بەکەڵکی بڵاوکردنەوە نەهات، ببورە.

* بۆ خاوەنی (ڕاوەماسی):

چاوەڕوانی بەرهەمی چاکترت لێدەکەین، بەڵام پێویستیت بە خوێندنەوەیەکی زۆر هەیە.

* بۆ خاوەنی (لەناو خەمێکی پیرۆزدا):

زۆر بخوێنەوە و، ئەم هەموو سەرماو سوڵەیە چیە تیا ئەژی . . خۆر لەوڵاتی ئیمەدا گەرمایی‌و ڕوناکی‌یەکی وا دەبەخشی مردووش زیندوو دەکاتەوە . . ببورە.

* بۆ خاوەنی (نامەیەك بەرەو ڕۆژهەڵات):

کاکە، چاوەڕوانی نووسینی باشترت لێدەکەین، ببورە

* بۆ خاوەنی (هەوایی):

تکا دەکەین لەنووسینەکانتدا شتی زۆر شەخسی مەنووسە، چونکە بەو کارە لە مەوزوعیەت لادەدەی، هیواداربن شتی چاکترمان بۆ بنێری . . ببورە.

* بۆ خاوەنی (پەشیمانی):

برا، تکایە جارێ بخوێنەوە و ببورە.

* بۆ (فرمێسك) خان: نامە ڕەنگینەکەمان پێگەیشت سوپاسی هەستی بەرزت دەکەین، تکایە لەیەك ڕووی کاغەز بنووسەو دێر بپەڕێنە، چاوەڕوانی بەرهەمی چاکترت لێدەکەین. ببورە.

# دواوشە

## شۆڕشی «17 - 30» تەممووز.. بەخشش و بنیادنان

گومانی نیە.. باس کردن لە بارەی شۆڕشی «17 - 30» تەمموزی مەزن و پیرۆزەوە، دەمانگێڕێتەوە بۆ ڕۆژان و ساڵانی پێشی «1968» لە ژیانی گەلی عیراقدا کە لە ژێر دەستی ڕژێمێکی کۆنەپەرستی و بەکرێگیراویدا دەژیا پڕ لە گیروگرفت و ناتەبایی و بارو دۆخێکی نائەمواریدا.. بەم شێوەیە لەژێر بارێکی ئازار و ئەشکەنجەو شەپۆلی لادان و گومرایی فەرمانڕەواکانیدا دەتلایەوە کە ڕۆژ بە ڕۆژ کاروانی ئەو ڕژێمە بەرەو تاریکی و نەمان ڕووی دەنا... ئەوەی ڕاست بێ لەنێو ئەو بارو دۆخانەدا شتێك لە هەست و دەروونی گەلدا دەچوولایەوە و هانی دەنا بەرەو ڕاپەڕین. بەرەو ڕزگاریخوازی دابین کردنی بەرەو ئاوات و ئامانج..

بەڵێ.. ئەو ئاوات و ئامانجانە هاتنەدی، کاتێ پێشڕەوەکانی بەعس لە بەرەبەیانی ڕۆژی «17» تەمووزی «1968»دا - ڕێگەی ڕاپەڕینیان گرتە بەر، بە هەڵکردنی ئاڵای ئاوات و ئامانجەکانی گەلی مەزنی عیراقی لە پێناوی دامەزراندنی بنیادنانێکی شۆڕشگێڕی و تواناداربۆ ئەوەی نیشتمانی عیراقی پیرۆزمان لە قۆناخێکی نوێ و پێشکەوتوویدا خۆی بچەسپێنێ.

بێگومان.. لە تێروانینێکی ورددا لە بارەی ئەو ئامانجانەدا کە شۆڕش ئاڵاکەی هەڵکردبوو، بەشێوەییکی ڕاست و ڕاستەقینەی هاتنەدی.. هەروەاش ئەو چەشنە گۆڕانکاریانە بەئاسانی وەدی نەدەهاتن گەر شۆڕشێکی توانادار نەبوایە و لەسەر بناغەییکی نەتەوەییدا نەچەسپابێ لە بەرەنگاربوونی بەرهەڵستکاران - لەناوخۆیی و دەرەوە... ئەوەبوو کە شۆڕشی «17 - 30» تەمموزی سەرکەوتوو ئەو هۆو نیشانانەی سەرکەوتنەکانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو کە بەڕاستی ڕوخسار و سیما و کەسایەتی ئەو حزبەی - حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست نواند کە سەرکردایێتی دەکرد لە نێو بیرو باوەڕەکانیدا کە توانی دەوری بێهاوتا و دیارداوەی خۆی بچەسپێنێ لە بنیادنان و پێشکەوتندا کە ئەوەش لە نێو دەوری بێهاوتایی و دیارداوەی سەرکردەی دلێر، سەرەك پێشەوا و فەرماندە هەڤاڵ تێکۆشەر صدام حسین - ەوە هاتووە، کە توانی بە هۆشمەندی و دانایی و زانایییەوە هەستێ بەو تاقی کردنەوە نمونەییە لە بنیادنانەدا کە لە ئەنجامدا حزبی بەعسی عەرەب سۆشیالست ڕێگەی تایبەتی خۆی بگرێتە بەر بۆ بنبادنان و چەسپاندنی ئەو تاقی کردنەوە نمونەییە، وەك لە ئەدەبیاتی حزب و فەموودە و نووسینەکانی سەرەك فەرماندە صدام حسین - دا هاتووە لە ناونیانەکانیدا کە بە کاروانی ڕێبازی ئەم تاقی کردنەوەدا بەستراوە.. وەك..

- تاقی کردنەوە تایبەتیکەی حزب..
- شۆڕش و ڕێگای نوێ..
- شۆڕشێکی نمونەیی..
- ڕێگای تایبەتی شۆڕش..

بەکارتێکردنی ئەم ناونیانانە شۆڕش توانی لە ماوەییکی زۆر کەمدا دەستکەوتێکی زۆر مەزن وەدی بێنێ کە دەورێکی بەرز و سەرەکی هەبوو لەبتەو کردنی سەربەستی و سەربەخۆیی سیاسی و ئابوری و بنیادنانی تاقی کردنەوەی سۆشیالیزمی نەتەوەیی..

«بەیان»

